

# دیوانی مەلا حەسەن نوحی زەنگنە

پرۆژەی ئنستیتوتی کەلەپووری کورد

کۆکردنەوەی: هەردەوێڵ کاکەیی

منتدى إقرأ الثقافي
للكتب ( كوردي - عربي - فارسي )
www.iqra.ahlamontada.com

KHI ئنستیتوتی کەلەپووری کورد

ئنستيتيوتی کەلەپووری کورد

ناوی کتێب: دیوانی مەلا حەسەن نەوحی زەنگنە
ئامادەکردنی: هەردەوێڵ کاکەیی
پێداچوونەوەی: ڕێبوار حەمە تۆفیق
ژمارەی بڵاوکراوە: ١١٤ ئنستیتیوت ـ ئۆفیسی کەرکووك
دیزاین: شارووخ ئەرژەنگی
چاپی یەکەم: چاپخانەی (شڤان) سلێمانی
تیراژ: ١٠٠٠
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی (١٦٣٢)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێ دراوە

سەرپەرشتیاری چاپ و بڵاوکردنەوە: بوار نورەدین

مافی چاپکردنەوەی بۆ ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد پارێزراوە ©

ناونیشان: عێراق ـ سلێمانی
گەڕەکی ڕاپەڕین ١٠٢- شەقامی پیرەمەگروون ١١

Tel: 00964 53 3137233
www.khi03.com
khi_2003@hotmail.com
publish@khi03.com

# ناوەرۆك

**پێشەکی:**

لەپاش ١١ی ئاداری ١٩٧٠، ئەدەبی کوردی بە شێوەیەکی گشتی، گەشەیەکی لەبەرچاوی بەخۆیەوە بینیی و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەرەوپێش هەنگاوی نا. جگە لە گۆڤار و ڕۆژنامە، بەسەدان نامیلکە و کتێبی جۆراوجۆر لە هەموو بوارەکاندا، بە چاپ گەیشتن و کەوتنە بەر دەستی خوێنەران. لەناو ئەو بەرهەمانەدا، بەرهەمی دەیان شاعیری پایەبەرزی نەتەوەکەمان بڵاوکرانەوە و کتێبخانەی کوردییان دەوڵەمەندتر کرد. تائێستاش زۆر دەستخەت و کەشکۆڵی بە کەڵك و بەرهەمی شاعیرانی نەناسراومان ماوە کە چاوەڕوانی ئەوەن بەر دەستی نووسەرانی بە وەفا بکەون و لەنەمان ڕزگاریان ببێت.

(مەلا حەسەنی زەنگنە) کە نازناوی (نەوحی) بۆ خۆی هەڵبژاردووە، یەکێکە لەو شاعیرە کوردپەروەرانەی کە وەك سەربازێکی ون، بە نەناسراوی ماوەتەوە و بەرهەمە پرشنگدارەکانی وەك پێویست ئازادییان بە خۆوە نەدیوە و هەمیشە لەترسی (ئەمن) و ئازادی نەخوازان، نەوە بەوەفاو بە ئەمەکەکانی، لە ناو سندوق و بوخچەدا پێچاویانەتەوە، بەڵام لە پاش پرۆسەی ئازادی ئێراق و ئەوکاتەی کە دەرگای ئازادی کرایەوە، بە چاك زانرا سەرجەم بەرهەمەکانی شاعیر کۆبکەینەوە و لە پاش لێکدانەوە و پۆلێنکردنیان، بەشێوەیەکی فراوانتر بڵاویان بکەینەوە.

لەسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا، بەشێك لە بەرهەمەکانی مەلا حەسەنمان ئامادەی چاپ کرد، بەتایبەتی ئەو شیعرانەی کە لەسەردەمی بەعسدا ڕێگەیان پێدرابوو بڵاوبکرێنەوە (واتە ئەو شیعرانەی کە بۆنی هەستی نەتەوەییان کەمتر لێ دەکرا) بەڵام مەخابن، لە بەر دەستکورتیی و نەبوونی، ئەم خەونەش نەهاتە دیی و تەنها ئەوەندەمان پێ کرا کە لە ترسی لە ناوچوونیان، کۆپییان بکەین و لەلای خۆمان بیان پارێزین. بەم شێوەیە، دەستخەتەکانی شاعیر و ژمارەیەك لە ڕەشنووسە کۆپی کراوەکانیش، لەلای کاك جەمیلی کوڕی شاعیر هەڵگیران و لە ساڵی (١٩٩٩)دا کاك جەمیل گەیاندییە ناوەندی چاپەمەنیی و ڕاگەیاندنی خاك و ئەوانیش ژمارەیەکیان لێ چاپ کرد[١].

---

١- مەبەست لەچاپەمەنی زاموا (پرۆژەی پاراستنی دەستنووسەکان)ە کە لە سلێمانی خەریکی ئەم کارە بوون، ئەوانیش هەر لەو ساڵەدا خستیانە بەر دەستی خاتوو (ئەرخەوان)ی شاعیر و ئەویش پێیاندا چووەوە. بڕوانە: دیوانی مەلا حەسەنی نوحی، ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاك، چاپەمەنی زاموا، چاپی یەکەم، ١٩٩٩.

## ژياننامەی شاعير

شاعير، ناوی (مەلا حەسەن كوڕی سۆفی عەبدولحەسەن كوڕی محەممەد كوڕی كوێخا ڕۆستەمی زەنگنە)يە. دايكی ناوی خاتوو (فاتمەی كچی حەمە عەزيز زەنگنە)يە.

نەوحی، لە ساڵی (١٩٠٠)دا لە گەڕەكی (سەرپەچەی خواروو) لە نێوان خانەقای (حاجی شێخ مستەفا) و مزگەوتی (مەلا برايم) لە شاری (سەقز) لە خۆرهەڵاتی كوردستان، لە دايك و باوكێكی كورد لە دايك بووە، هەر وەك خۆی لە شيعرێكدا لە ساڵی (١٩٦٤) ئامـاژەی پێكردووە و دەنووسێت:

هەزار و نۆسەد، هاتمە دنياوە
هێشتا لە ژينام كە شەست و چوارە

لە دەوروبەری شارۆچكەی (سەقز)ی سەر بەشاری سنە، لەتەمەنی حەوت ساڵيدا دەستی بە خوێندن كردووە، لە پێناوی خوێندن و بەدەستهێنانی زانياريدا، لەتەمەنی لاوێتيدا بە تەنيا و لە ساڵی (١٩٢٦)دا بە فەقێيەتی دێتە باشووری كوردستان و گەلێ ئەم گوند و ئەو گوندی كردووە و شارەكانی كوردستان گەڕاوە، ئيتر بۆ هەميشەيی لە دەڤەری گەرميانی كەركووكدا ماوەتەوە و بۆ (سەقز) نەگەڕاوەتەوە. لەم بارەيەوە دەڵێت:

موددەيێ حوجرە بە حوجرە و دەربەدەر كەوتم نەخۆش
دوژمنم شاد و گەلێك و من غەمين و دڵ خرۆش
كەس نەناس و بێكەس و بێزار و داماوم بەلام
كارەبای ڕووم سوورە فرمێسكم بە خوڕ گەوهەر فرۆش

جگە لە زمانی دايكی، فارسيی و عەرەبيشی بە چاكی زانيوە. لە پارچە كاغەزێكدا دەنووسێت (پاش خوێندنی فارسيی و كوردی، لە ساڵی (١٣٤٨ك) كە دەكاتە (١٩٢٩ز) دەستم بە خوێندنی عيلمەكان كرد و لە ماوەی هەشت ساڵدا، توانيومە ئيجازە وەربگرم)[١].

لەلای مامۆستا (ساڵح ئەفەندی قەرەداغی) لە (خانەقی) بۆ ماوەی دوو ساڵ خوێندويەتيی و دواتر چووەتە (كفری) و بۆ ماوەی پێنج ساڵ لەلای (مەلا سەعيدی موفتی سيوەيلی) خوێندويەتی. لەساڵی (١٩٣٦ز)دا بۆ شاری (كەركوك) چووە و لەلای مامۆستا (مەلا تاهيری كەركووكی) بۆ ماوەی ساڵێك خوێندويەتيی و هەر ئەو مەلايەش لە ساڵی (١٩٣٧ز)دا ئيجازەی مەلايەتی پێ داوە.

---

١– واتە: ساڵی (١٩٣٧) ئيجازەی مەلايەتی بەدەست هێناوە.

مەلا حەسەن لەگەڵ چەند ناودارێکی کورددا، ئاشنایی و دۆستایەتی هەبووە، لەوانە (مەلا جەمیل ڕۆژبیانی ١٩١٣-٢٠٠١ز)، مامۆستا (شوکر مستەفا ١٩٢٦-٢٠٠٣ز)، (فەقێ ڕەشید ئاغای زەنگنە ١٨٦٤-١٩٦٦ز)، (سەیید عەبدولحەکیم محەممەد ١٨٩٢- ١٩٥٧ز)، (شێخ عەبدولکەریم قادر کەرەمی ١٨٧٩-١٩٥٤ز)، (شاعیر کاکە حەمەی ناری ١٨٧٤-١٩٤٤ز)، (قانیع ١٨٩٨-١٩٦٥ز)، (جەمیل بەگی بابان) و (کەریم بەگی جاف ١٨٨٩-١٩٤٩ز) و بەدەیان ناوداری تریش.

لە ساڵی (١٣٥٦ك) کە دەکاتە (١٩٣٨ز)، ئاشنایەتیی و دۆستایەتی لەگەڵ (شێخ عەلی ١٨٦٢-١٩٣٩ز)ی کوڕی شێخ محەممەدی حیسامەدینی تەوێڵەییدا پەیدا دەکات و تەریقەتی نەقشی لەلا وەردەگرێت و بەپیری خۆی دای دەنێت، جا لە شیعرێکیدا دەربارەی ئەم پیرەی دەڵێت:

لە بیری پیرەکەم ناچم لەخۆ، ناچم ئەگەر ناچم
کەمەندی ئەو لە ملمایە، لە گۆمی غەم کەڕو ناچم
ڕەواجی خەزنەیی شەرعیی نەبی بووم، تا وەکو دوێنێ
کە ئێستا قەڵب و ڕوو زەردم لە هیچ لایەکەوە ناچم

لە پاش مردنی باوکی، ویستویەتی دەست لە خوێندن هەڵبگرێت، بەڵام فاتمە خانی دایکی، بەمە ڕازی نەبووە و بۆ بەردەوام بوونی، بووەتە هاندەری تەواوکردنی خوێندنەکەی. لەپاش وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی، وردەواڵە و کتێبەکانی دەپێچێتەوە و بۆ ئاوایی (دوانزە ئیمام)[1] دەڕوات. لەوێ، دەبێتە مەلای گوندەکە و ماوەیەك لەو ئاواییەدا دەمێنێتەوە تا... لە دەوروبەری ساڵی (١٩٤٣ز)دا دەڕواتە ئاوایی (مەلا ئۆمەر)[2] و لەگەڵ (حەمدیە) خانی کچی (کەریم زۆراب ١٩٢٢-١٩٨٧ز)دا زەماوەند دەگێڕن و دەبنە هاوسەر و خێزانێکی هەشت کوڕ و سێ کچ بەناوەکانی: مەلا حیسامەدین، مەلا وریا، ئەمین، نوری، جەمیل، تاهیر، سەلام، خالید، خاتوو ئەختەر، دڵسۆز و نەورۆز، پێك دەهێنن.

ئنجا بۆ ئاوایی (کانی قادر) دەڕوات و لەوێشەوە بۆ ئاوایی (ئاوباریك)ی سەر بە قادر کەرەم، کە لەشیعرێکیدا باسی دەکات:

من (حەسەن) ناوم کە (نەوحی) هام لە ئاوباریکی گڵ
ئەم وتارەم هۆنییەوە لە بۆ گەنجانی کوردەوار

---

١- دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شاری (کفری)یەوە.

٢- سەر بە شارۆچکەی (قادر کەرەم)ـە لە دەڤەری کەرکوك.

جگە لەو ئاوایی و شوێنانەی کە باسمان کردن، نەوحی لە چەند شوێنێکی تریش نیشتەجێ بووە، وەکو ئاوایییەکانی (خانی ڕۆستەم ئاغا)[1]، (کارێز) و (قنگریان)[2]، تاوەك سەرەنجام بۆ گوندی (مەلا تۆمەر) دەگەڕێتەوە و بەیەکجاری لەوێ نیشتەجێ دەبێت.

مەلا حەسەنی شاعیر، پیاوێکی ڕاستگۆ، هەقپەروەر، بوێر، قەڵەم بەدەستێکی بە توانا و دەستخەتخۆش بووە و دەستێکی باڵاشی لە دروومان و دروستکردنی خانوو و کۆشك و تەلاردا هەبووە. ئارەزووی لە ڕاو و سەیران و سواری ئەسپ و ماین، بووە. هەمیشە ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین و میوان دۆست بووە. نیشتیمان و نەتەوەکەی خۆش ویستوە و شانازی بە ناودارانی گەلەکەیەوە کردووە، لەبەرئەمەشە کە بۆ گەلێك لەناودارانی کورد گریاوە و فرمێسکی بۆ هەڵڕشتوون و بە شیعر شیوەنی بۆ کردوون، وەك: شێخ مەحموودی نەمر، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، حەمە بەگی فەتاح بەگی جاف، کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، حاجی قادری کۆیی، کاکە حەمەی ناری، قانیع، سەلاحەدینی ئەیووبی، جەمیل بەگی بابان، شێخ عەلی حیسامەدین تەوێڵەیی، شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی قادرکەرەمی، شێخ محەممەد شێخ عەبدولکەریم بەرزنجی قادرکەرەمی، شێخ حوسێن شێخ قادر کربچنە، شێخ قادری سیامەنسووری، شێخ محەممەد عارفی تاڵەبانی، عەلی ئاغای زەنگنە،... دەکرێت هەر لەبەر ئەمەش بێت کە نازناوی (نەوحی) بۆ خۆی هەڵبژاردووە و شیعری پێ وتووە؟ چونکە ئەم وشەیە بە عەرەبی واتای گریان و شیوەن بۆ مردوو دەگەیەنێت.

شاعیرمان مەلا حەسەن نەوحی لە ڕۆژی (١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٦ز) بە نەخۆشی زەحیری لە نەخۆشخانەی شاری (خورماتوو) کۆچی دوایی کردووە وماڵئاوایی لە ئەدەب و نەتەوە و نیشتیمانەکەی کردووە، هەر لە خورماتوویش تەرمەکەیان بە خاك سپاردووە.

نەوحی لە (١٤ی ئەیلوولی ١٩٣٨ز)دا تووشی نەخۆشییەکی قورس دەبێت، تەنانەت وای لێ دێت کە مەرگ بە چاوی خۆی ببینێت، لەبەرئەمە، لە لاپەڕەیەك لە دەفتەرە دەستخەتەکانیدا منداڵەکانی ڕادەسپێرێت و وەسیەتیان بۆ دەکات تا لە پاش مردنی، دیوانە شیعرەکەی بە ڕێکوپێکی لە چاپ بدرێت و بکەوێتە بەر دەست و دیدی خوێنەرانی نەتەوەکەی. خۆشبەختانە لەو نەخۆشییە ڕزگاری دەبێت، بەڵام تووشی (شەقەسەر) دەبێت. وەك دەگێڕنەوە: هەر کە ئەم ئازارە بەرۆکی پێ بگرتایە، بۆ چەند ڕۆژێك لە کار و نووسینی دەخست.

---

١- سەر بە شارۆچکەی (قادر کەرەم)ە لە دەڤەری کەرکووك.

٢- سەر بە شارۆچکەی (کفری)یە لە دەڤەری گەرمیان.

مەلا حەسەن لە ڕاپەڕینە مێژووییەکەی (٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ن)دا کە لەشاری سلێمانی دژ بە ڕژێمی پاشایەتی ڕووی داوە، بەشداریی کردووە و بە سووکیش بریندار بووە و دەربارەی ئەیلوولی ڕەش و شۆڕشی ئەیلوولیش، شیعری وتووە.

لە (١٩٥٩/٨/٢٢ن)دا بە تاوانی کوردایەتیی و نیشتیمانپەروەری، بۆ ماوەی ساڵێك لەگەڵ (ئەحمەد مەحموود و حاجی ڕەشید مفتە)ی دانیشتووی ئاوایی (ئاوباریك) لە پۆلیسخانەی کەرکووك بەندکراوە. لەم گرتووخانەیەشدا ئەم شیعرەی داناوە:

نە "با" لێی داوم نە هەتاو — بەندم سێ مانگە تەواو
هێشتا لای ئەو کەمە — نەپرسیوە مەحکەمە
هیچ ناپرسێ لە تاوان — ئایا لەمم یا لەوان؟
بە خەبەری کازیبە — بووەتە هێزی جازیبە
شەرتی بە دادی وایە — بپرسێ لەو کابرایە
کابرا چلۆنی چاکی؟ — فەوزەوی یا بێباکی؟
مەعنای بێباکی وایە — هەر چاوە هێز و پارە
ئیجازەی وا لە کایە — لەبۆ ژیان بە کارە
خزم و برا بە تۆ چی؟ — کە تۆ بەندی بەمەرجێ

نەوحی زۆر شارەزووی لە زانین و هۆشیاریی کردووە، بۆیە ئەم خواستەی لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگی دەداتەوە و لە هۆنراوەیەکدا دەڵێت:

لە دین و دنیا پیاو هەر بزانە هەواڵی غەمیش هەموو بزانە
پێغەمبەر وەلی عولەما و پاتشا هەموو لە ڕیزی پیاوی بزانە
بەندیی و گیراوی لە دنیای ڕووناك ئاگریش لەولا هەر بۆ نەزانە
نەزان چوزانێ کەچی بەسەر دێ؟ هەر ئەوەی بەسە ئەڵێن نەزانە

لە چلەکانی سەدەی ڕابردوودا چووەتە ڕیزی حزبی هیواوە، لە پاش هەڵوەشانەوەی ئەو حیزبە، لە سەرەتای پەنجاکانی هەمان سەدەدا، چووەتە ڕیزی پارتی دیموکراتی کوردستان و لە بواری ڕامیاریشدا کاری کردووە، وەکو خۆی لە ساڵی (١٩٦١ن)دا وتویەتی:

چونکە تۆ چاوی پارتی بەڕێزی
لە دڵی پارتی خاوێن پەرێزی
منیش یەکێکم ئەندامی کۆنە
کە لێم بپرسی ئەحواڵت چۆنە؟

لـه شـیعرێکی تـردا، ستایـشی جـەژنی نـەورۆز و خوالێخۆشـبوو مـەلا مـستەفای بـارزان و پێشمەرگە و پارتی دیموکراتی کوردستان دەکات و دەڵێت:

ســــڵاوێکی شۆڕشــــگێڕانەی ئــــازا
لـەبۆ ئـەو کەسـەی پێـشمەرگەی نـاوە
واگیـان بـەخت ئـەکا لـە ڕێـی کوردسـتان
خەنجـەری دەسـتی وا تـازە سـاوە
گـــڕی ئـــاگری نـــەورۆزی ئێمــــە
جـەرگی دوژمنـی سـووتان وەك قـاوە
ئـــیتر بــا بــژی پــارتی نەبـەزمان
بــە دیمـــوکراتی لـــە هــەموو لاوە
بـــۆ ســەرکردەیی مـــستەفای بـــارزان[1]
بـــژی کوردســـتان وەك کـــاتی کـــاوە

لە سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشـی ئـەیلول، لـە دەفـەری گەرمیانـدا، مـەلا نـەوحییان کردووە بەقازیی و هەمیشە لە بواری شەرع و ئاییندا، ڕاوێژیان پێ کردووە.

شـاعیر ڕۆڵەیـەکی بـە وەفـا و نیـشتیمانپەروەر بـووە، هەمیـشە بـەرگری لـە میللەتـە ستەمدیدەکەیی و خـاك و نیـشتیمانەکەی کـردووە و گـەلێ شـیعری جۆراوجـۆری بـۆ وتـوون و خوازیار بووە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان، کورد و کوردستان لە دەستی دوژمن و بێگانە ڕزگاری بێت.

شاعیر ئارەزووی لە یەکێتی، برایەتی، دۆستایەتیی و تـەبایی بـووە و دژ بـە نـاکۆکیی و ئاژاوە و بەربەرەکانی بووە و داوای سەربەخۆیی بۆ نەتەوەکەی کردووە:

تـۆزی ڕێگـەی یەکیـەتی دەرمـانی دەردە سـەربەخۆ
بـاش ئـەکا تیمـاری دەردی وا بـە تـەنیا ژان ئـەکا
حیکمـەتی یۆنـانی، وێنـەی گەوهـەری واتـەم نییـە
بـۆ کەسـێ بـیری ببـێ واتـەم دڵـی بوریـان ئـەکا

شاعیر بە دیالیکتی گۆرانیش شیعری وتـووە، ئـەوەتا ڕووی دەمـی دەکاتـە جـەماوەر و پێیان دەڵێت: بڵێن: بەمەلا ئەگەر بەزمانی کوردی تـەڵقینی لا دەسـت دەکـەوێت، بـا کاتێـك مردم، بێت و لە سەر گۆڕەکەمی بخوێنێت:

---

١- (١٩٠٣/٣/١٤ -١٩٧٩/٣/١ز).

باچـــه بـــه كـــوردی تـــه‌ڵقینی (نـــه‌وحوی)
بوانـــۆ مـــه‌لا گـــه‌ر هه‌نـــه‌ن چـــه لاش!

شاعیرمان له بواری ئه‌وینداریشدا ئه‌سپی تاوداوه و گه‌لێ شیعری جۆراوجۆری داناوه، ئه‌مه‌ش چه‌ند نموونه‌یه‌كه له‌و شیعرانه‌ی:

چـاوه‌كه‌م زانیوتـه به‌نـده عه‌بـد و خزمـه‌تكارتم
مه‌سـت و بێبـاك و ده‌بـه‌نگی دیـده‌یی خومـارتم
بۆیـه قـارت گرتـووه ئه‌مخه‌یتـه بـه‌ر بـاری مـه‌راق
مـــن موســـڵمانی دوو چـــه‌می غـــه‌ددارتم

نه‌وحی خه‌می منداڵانی كوردیشی خواردووه و له شیعرێكیدا ئامۆژگارییان ده‌كات و هانیان ده‌دات بۆ ئه‌وه‌ی له خوێندن به‌رده‌وام بن؟ چونكه خوێندن هه‌وێنی ڕۆشنبیری و زانیارییه و ده‌بێته هۆی پێشكه‌وتن و به‌ده‌ستهێنانی مافه ڕه‌واكانی نه‌ته‌وه‌كه‌مان، وه‌ك ده‌ڵێت:

مـــن لـــه گـــه‌ڵ تۆمـــه منـــداڵی كـــوردان
ئـــه‌ی نه‌ونـــه‌مامی نێـــو بـــاغی ژیـــان
لـــه نـــاو خوێنـــدنا خـــۆت بـــچورستێنه
لـــه ڕێگـــه‌یینا مافـــت بـــستێنه

مه‌لا نه‌وحی زۆر له مه‌لایه‌تی بێزار ده‌بێ و خوازیار بووه به ڕه‌نجی شانی بژێویی بۆ ماڵ و منداڵی دابین بكات، بۆیه له شیعرێكدا بێزاریی و نیگه‌رانی خۆی ده‌رده‌بڕێ و ده‌ڵێت:

هـــه‌ی خۆشـــی لـــه خـــۆم كـــه ڕزگـــاریم هـــات
لـــه مه‌لایـــه‌تی و ســـه‌رفتره‌و زه‌كـــات
هیوامـــه ئـــیتر ئیمـــان ده‌ربـــه‌رم
لـــه ژیانیـــشا بگـــه‌م بـــه ئـــاوات
كرێكـــاری كـــه‌م بـــاخو كۆڵكیـــشی
گـــه‌لێ چـــاتره لـــه مـــه‌لای دێهـــات

## دەستخەت و بەرهەمەکانی شاعیر

نەوحی گەلێ شیعری جۆراوجۆری بەشێوەی عەرووز و دە برگەیی بە زمانی کوردیی و فارسیی لە پاش بەجێ ماوە. شیعرە کوردییەکانی بە شێوەیەکی گشتی دەبنە حەوت بەش (نیشتیمانی، نەتەوایەتی، مێژوویی، ئەوینداری، کۆمەڵایەتی، شین و لاواندنەوە "دولگە"، ئایینی). گەلێ رووداوی مێژوویی بە شیعر روون کردووەتەوە وەك: مێژووی بناغەی بابا ئەردەڵان و سۆران و بابان و شارەزوور لە سەردەمی حەموورابییەوە تا سەدەی رابردوو.

وەك نەوەکانی دەگێڕنەوە، زۆربەی بەرهەمە فارسییەکانی، لە ساڵی (١٩٦٥ز)، لە ئاوایی (مەلا ئۆمەر)دا، فەوتاون و تەنیا چەند پارچە شیعرێکیان لێ ماوەتەوە کە هەندێ لە بەرهەمە کوردییەکانیشی کەوتوونەتە لای شاعیری نەناسراوی گەرمیانی (قەمەر بەگلەر ئەڵماس ١٨٩٦–١٩٧٨ز) کە خۆشبەختانە توانیمان زۆربەی ئەم شیعرانە بەدەست بهێنین و لەگەڵ ئەمانەی لای خۆماندا بەراورد و تاو وتوێیان بکەین و لێرەدا بڵاویان بکەینەوە.

بەرهەمەکانی شاعیر لە هەشت دەفتەر و زیاتر لە (١٠٠) نامەی جۆرا و جۆر پێکهاتوون و هەموویشی بە دەستی شاعیر خۆی نووسراونەتەوە کە ئەمانەن:

دەستخەتی یەکەم: قەوارەکەی (٢١,٥×١٤ سم)ـە، بریتییە لە (١٢٥) لاپەڕە، لە (١٨ی رەمەزانی ١٣٧٢ك)، بەرامبەر بە (١٩٥٣ز)، لە ئاوایی (ئاوباریك) بە مەرەکەبی سەوز و مۆر نووسراوە.

دەستخەتی دووەم: بریتییە لە (١٤٤) لاپەڕە و بەهەمان قەوارەو بەهەمان شێوەی دەستخەتی یەکەم نووسراوە.

دەستخەتی سێیەم: قەوارەکەی (٢٢×١٧ سم)ـە، بریتییە لە (١٠٥) لاپەڕە، بەمەرەکەبی مۆر نووسراوە.

دەستخەتی چوارەم: قەوارەکەی (٢٢×١٧ سم)ـە، بریتییە لە (٩٢) لاپەڕە، دیسان بەمەرەکەبی مۆر نووسراوە.

دەستخەتی پێنجەم: قەوارەکەی (٥,٥ ×١٣ سم)ـە، بریتییە لە (١٤٣) لاپەڕە، دوو لاپەڕەی بەمەرەکەبی سوور و ئەو لاپەڕەکانی تریشی بە مەرەکەبی مۆر نووسراوە.

دەستخەتی شەشەم: قەوارەکەی (٢١×١٦,٥ سم)ـە، بریتییە لە (٥٤) لاپەڕە، بەمەرکەبی مۆر نووسراوە.

دەستخەتی حەوتەم: قەوارەکەی (١٦,٥×١١ سم)ـە، ئەم دەفتەرە زۆری لێ فەوتاوە، تەنها (٤٤) لاپەڕەی لێ ماوەتەوە، بەمەرەکەبی شین و مۆر نووسراوە.

دەستخەتی هەشتەم: قەوارەکەی (١٦,٥×١٠,٥ سم)ـە، ئەم دەستخەتەیش زۆری لێ ون بووە، تەنها (٢٢) لاپەڕەی لێ ماوەتەوە.

تـەنیا دەسـتخەتی ژمـارە (١) مێـژووی پێوەیـە کـە سـاڵی (١٩٥٣ن)یـە ، ئـەوانی تریـان هیچیان مێژوویان لەسەر تۆمار نەکراوە، بەڵام وادەردەکەوێت کە دەفتەری ژمارە (٢)یان لە سەرەتای (١٩٥٣ن)دا نووسرابێت؟ چونکە دەفتەرەکە لەگـەڵ دەفتـەر و دەسـتخەتی ژمـارە (٢)دا لە ڕووی قەوارە و چۆنێتی کاغەزەکانیانەوە کتومت (دەقـاودەق) هـەر وەکـو یـەکن و هەردوو دەفتەرەکـەش لـە یـەك کارگـە و یـەك سـاڵدا دروسـت کـراون، بـەڵام ژمـارەی (٣) و (٤)یان پێدەچێت لە سەرەتا یان ناوەڕاستی ساڵەکانی چلی سـەدەی ڕابـردوودا نووسـرابن. دەسـتخەتەکانی ژمـارە (٥) و (٦) و (٧) و (٨)یـش لـەوە دەچـێ لەسـاڵەکانی سـی هـەمان سەدەدا تۆمار کرابێتن.

ئێمە لەناو ئـەو دەسـتخەتانەدا، زیـاتر پـشتمان بـە دەسـتخەتی ژمـارە (١) بەسـتووە و کردوومانە بەسەرچاوە و بنەڕەتی ئەم کتێبە؟ چونکە تازەترین دەستخەتی شاعیرە.

لە پـاش دەسـتخەتی ژمـارە (١) دەفتـەری ژمـارە (٢) دێـت، هـەموو دەسـتخەتەکانمان لێکدایەوە و بینیمان جیاوازییەکی یەکجار زۆریان تێدایە.

تاڕادەیەك دەستخەتەکانی ژمارە (٤، ٥، ٦، ٧، ٨)مـان پـشتگوێ خـست؟ چـونکە شـاعیر لەکاتی گوێزانەوەی بەرهەمەکانیدا لەو دەستخەتانەوە بۆ دەفتەری ژمارە (١) و (٢) زۆر لە وشە و خـشتەکانیانی گۆڕیـوە و دەسـتکاری کـردوون. جـا لەبـەر زۆریـی و چـڕی جیاوازیـیـەکان، بەپێویستمان نەزانی لە پەراوێزدا ئاماژەیان بـۆ بکـەین. هـەروەها هەنـدێ شیعریـشمان بەرچـاو کەوت کە لە داوێنی دەستخەتی ژمارە (١) و (٢)دا نەبوون، بەڵام لە ناو نامـە و دەسـتخەتەکانی تردا هەبوون، ئێمە هەر هەموو ئەوانەیشمان فەرامۆش نەکرد و کەڵکمان لێ وەرگرتن.

## چۆن بەرهەمەکانی شاعیرمان بەدەست هێنا؟

زۆربەی زۆری دەستخەتەکانی شاعیر، لە لای کورەکانی بە چاکی پارێزرابوون، بە تایبەتی (مەلا حیسامەدین) و کاک (جەمیل). لە ڕێگای کاک (عەبدوڵڵا نفووسی کاکەیی)ـەوە، ئاشنایەتیمان لەگەڵ شادڕەوان (مەلا حیسامەدین) و (جەمیل)ی کوڕیدا پەیدا کرد کە دانیشتووی (خورماتوو)ن، بەنیازی بە دەستهێنانی بەرهەمەکانی مەلا حەسەنی باوکیان، ئەوانیش بەوپەڕی ئەمەکدارییەوە پێشوازییان لێ کردین و ڕۆژی (١٩٨٨/٣/٣١ن) هەموو ئەو دەستخەتانەی کە لایان بوو، هێنایانەماڵمان و پێیان سپاردین، تا لە پاش ساغکردنەوەیان، بەچاپیان بگەیەنین و بڵاویان بکەینەوە. دەستخەتەکان بریتی بوون لە دەستخەتی ژمارە (١، ٢، ٣، ٤، ٥) لەگەڵ بڕێ نامەی جۆراوجۆر.

خوالێخۆشبوو مامۆستا (مستەفا نەریمان)یش لە ساڵی (١٩٩٣ن)دا، ئەم دەستخەتانەی شاعیری پێشکەش کردین: دەفتەری ژمارە (٦، ٧، ٨) لەگەڵ (٣٨) نامەدا، ئەویش لە کاتی خۆیدا لە شاعیری میللی (قەمبەر بەگلەری) بەدەست هێنا بوو.

ئەوەشمان لە یاد نەچێت لە ساڵی (١٩٧٠ن)دا، دەستخەتی ژمارە (٣، ٤، ٥) کەوتووەتە بەردەستی نووسەر و چیرۆکنووس مامۆستا (محەممەد ئەحمەد ئیسماعیل) ئەویش زۆربەی هۆنراوەکانی ئەو سێ دەفتەرەی لە دوو دەفتەری قەوارە (٢٢×١٧سم)دا تۆمار کردووە، یەکەمیان (١٥١) لاپەڕە و ئەوی تریشیان (١٦٤) لاپەڕەی لێ نووسیوە. بەنیازی ئەوەی لە پاش شیکردنەوە، بڵاویان بکاتەوە، بەڵام مەخابن لەئاکامدا بۆی نەڕەخساوە و نەوەکانی مەلا نەوحیش هەموو دەستخەتەکانیان لێ سەندووەتەوە، بەڵام دەستخەتی ژمارە (١) و (٢)ی لەگەڵ دەستخەتەکانی تردا بەراورد نەکردووە. بۆ ئەم دیوانە تا ڕادەیەك کەڵکمان لەو دوو دەستخەتی مامۆستا محەممەدیش وەرگرتووە کە بە ڕێنووسی کوردی تۆمار کرابوون.

شیعرەکانی ناو ئەم دیوانە، بەپێی ئەلف و بێی کوردی ڕیز کراون و هەر بەشێکیش بەجیا ئامادە کراوە. ئەگەرچی لە هەندێ دێڕە شیعردا لەنگی "کێش و سەروا" بەدی دەکرێت، بەڵام لەبەر پاراستن نرخ و بەهایان وەك خۆیان ڕێنووس کراونەتەوە و هیچ دەستکارییەکیان نەکراوە. هەروەها لەوشوێنانەشدا کە پێویستیان بە خاڵبەندی هەیە، هیچ نیشانەیەکمان دانەناوە و دەستنووسەکان چۆنن بەهەمان شێوە نووسیومانن‌ەتەوە، تەنها ئەوەندە نەبێت بە پێی ڕێنووسی ئەمڕۆی ڕێنووس کراونەتەوە. سەبارەت بە لێکدانەوەی وشەکانیش، تەنها لێکدانەوەیان بەپێی مانا فەرهەنگییەکەیان بۆ کراوە و لەم بوارەدا جێی خۆیەتی سوپاسی مامۆستا (ئەحمەد تاقانە) بکەین کە لە لێکدانەوەی چەند وشەیەکدا هاوکاری کردین.

هەردەوێڵ کاکەیی

کەرکووك ٢٠٠٧

## شەوگاری وەها فرسەتە

شەوگاری وەها فرسەتە، ساقی وەرە ئێستا
مەی بێنە بە پەیمانەیی، ئەو دیدەیی مەستا[1]
ئەی بەختی سیا[2]، زوڵفی سیا، ڕامێکە بۆ من
پەیوەندی دڵ و دینە، لە بۆ بادە پەرستا
پەرژینی مەکە باغی گوڵی ڕوومەتی ئاڵت
وەك تازە بەهارە، هەموو گوڵ دەستە بەدەستا
دڵ خاڵی لەبی[3] خۆتە، کە سووتاوە بە داغت
دەرمانی بە ماچی لەبی تۆ، ماوە ئەمێستا[4]
ئەی بادی سبەینێ[5]، وەرە بۆ خزمەتی یارم
ئەم نامەیی دووری بدە بەو هەق نەپەرستا
ئەو دەشتە کەوا شینە، چەمەن[6] سوورە عەزیزم
دڵ باری غەمی پێوەیە، بەو دینە دروستا
من چاوەڕەهی[7] غەمزەیی ئەو یارەمە ئەمڕۆ
وەك (نەوحی) لە دەلیای[8] خەفەتا کەشتی شکستا

---

١- ئەم جۆرە پاشبەندە لە زمانی کوردیدا باو نییە.
٢- سیا: ڕەش.
٣- لەب: لێو.
٤- ئەمێستا: هەر ئێستا، ئێستا.
٥- بادی سبەینێ: بای بەرەبەیانی فێنك.
٦- چەمەن: چیمەن، مێرگ.
٧- چاوەڕەهی: چاوەڕێی.
٨- دەلیا: دەریا.

## تا نەمكوژن

تا نەمكوژن و نەمخەنە سەر داری قەنارا
خوێنم نەڕژێنن بەسەر ئەو حەوز و فوارا
ناڕۆم و لە بەر دەرگی، ئەخوێنم بە هەژاری
بۆ ماچی لەبی وەقفە[1]، لە بەر حوسنی[2] بەهارا
نوختەی دەم و خاڵی، لەب و سەر حەڵقەیی زوڵفی
وێرانی ئەكەن كابەی دڵ بەسەنگی بوخارا[3]
گەردن وەكو شووشەی عەرەق و، پیاڵەیە چاوی
مەززەی هەیە وا سۆفی هەموو مەستە لە شارا
دەروێش سیفەت و ساكینی[4] سەر حەڵقەیی زوڵفم
مەیخانە لەوێ دوورە لە مسكێن و هەژارا
بەزمی كەیی و هاژەی مەیی و دەنگی نەیی[5] و ساقی
شیرینە بە یادی جەم[6] و كەیكاوس[7] و دارا[8]
دڵخوازی ئەتۆیە دڵ و گوڵزاری مەبەس بوو
(نەوحی) كە ئەبا سوژدە لە ئەبرۆیی نیگارا

---

١- وەقف: بەو شتانە دەگوترێت كە پێشكەش بە مزگەوت دەكرێن.

٢- حوسن: جوانی.

٣- بوخارا: ناوی شارێكی گەورەیە لە ناوەڕاستی ئاسیای ناوەڕاستدا كە شاری ئیمامی بوخارییە.

٤- ساكین: هێمن، بێدەنگ، وەستاو.

٥- نەی: ئامێرێكی موزیكی فۆلكلۆرییە.

٦- جەم: كورتكراوەی ناوی شا (جەمشید)ە، كە بە گوێرەی داستانەكانی شانامە، چوارەمین پاتشای پێشدادی بووە. (بڕوانە: دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێكۆڵینەوە و ساغ كردنەوەی: دكتۆر مارف خەزنەدار، دار الحرية للطباعة، بەغداد، ١٩٧٧، ل٢٢٦.)

٧- كەیكاوس: دەیەمین پاتشای زنجیرەی كەیانییە.

٨- دارا: دوا پاتشای بنەماڵەی هەخامنشی لە ئێراندا، لە ساڵی (٣٣٠پ ز) كۆچی دوایی كردووە.

## ئەو دەشتە

ئەو دەشتە خۆ گەڵێ ئاسکی تێدێ لە بەهارا
وەك باغی بەهەشت و حەرەمی کابەیی سارا
بێستانی گوڵی ڕوومەتی غونچەی دەمی نابی[١]
خەزنەی بە بەها قیمەتی ڕۆحی لە کەنارا
لەو چیمەنە بێ مەینەتە، موتریب بە نەوا[٢] بێ
ساقی بە دەف و مەی بە کەف و سوخمەیی خارا[٣]
ئاشوفتەیە[٤] ڕەیحانە و خونچە کەوا نەپشکووت[٥]
تا پێنەکەنێ فیتنەزەدەی[٦] بەڵخ و[٧] بوخارا[٨]
سوڵتانی برۆ، جەیشی مژە[٩]، زوڵفتە بەیداغ
شاماتی[١٠] ڕۆخت[١١] بوو بە پیادە و بە سووارا
دڵ تازە زامدار و بە غەمی غوربەتی[١٢] ڕووتم
سندووقی سەرت دێمەوە ئەو باغ و حەسارا
لەو ساوە پێبەندی گرەی[١٣] زوڵفتە (نەوحی)
خوێن زاوەتە دوو چاوی و ئەڵوەندی[١٤] کەنارا

---

١- ناب: پاك و خاوێن.
٢- نەوا: دەنگ و ئاواز.
٣- خارا: جۆرە کوتاڵێکی بە نرخ بووە و لەکۆندا بەکارهاتووە.
٤- ئاشوفتە: پەرێشان، خەمگین، ژیانی تاڵ و سەخت.
٥- پشکووت: کرانەوەی خونچەی گوڵ، چرۆ دەرکردنی دار و درەخت لە بەهارادا.
٦- فیتنەزەدە: ئاژاوەگێڕ، ئاژاوەچی.
٧- بەڵخ: ناوی شارێکە دەکەوێتە ئەوپەڕی ئێرانەوە.
٨- بوخارا: ناوی شارێکی گەورەیە لە ناوەڕاستی ئاسیای ناوەڕاستدا کە شاری ئیمامی بوخارییە.
٩- مژە: موژە، برژانك.
١٠- شامات: کش مات، ئەو وشەیەی کە لە یاری شەترەنجدا لە کاتی کوشتنی شا "مەلیك"دا دەوترێت.
١١- ڕۆخ: لێوار، کەنار.
١٢- غوربەت: دووری لە وڵات یان دۆست و خزم و کەسوکار.
١٣- گرە: گرێ.
١٤- ئەڵوەند: ئەڵوەن، ڕووبارێکە بە ناو خانەقیدا تێپەڕ دەبێت. هونەرمەندی ناسراوی کورد (خودادادا عەلی ١٩١٢-١٩٨٧ز) گۆرانییەکی خۆش و دڵگیری بەناوی ئەم ڕووبارەوە تۆمار کردووە، سەرچاوەکەی لە چیاکانی دەڤەری سەرپێڵ زەهاودایە کە سەر بە شاری کرماشانی کوردنشینە.

## بەشەو شپرزە بۆ تۆ

بە شەو شپرزە بۆ تۆ، پەژارە بووم لە ڕۆژا
لە چاوەی خەزنەیی دڵ، چی گەوهەرم ئەڕێژا
خەیاڵم وایە ئێستە کە خاکی بەر دەرت[1] بم
نەمزانی دڵ بە زوڵفت پێبەندە خۆ لە مێژا
پێم زۆر خۆشە خاکی پێت بێ دڵ و سەر و گیانم
چونکە سەبەی دیارە مێشکم لەوێ ئەبرژا[2]
لەخزمەتی ئەو کەسەی وا عارەق فرۆشی ڕووتە
بەرماڵەکەت بە گرەو نێ لەکاتی بانگ و نوێژا
ئەمزانی ئێشی تۆیە موژدە بە ڕۆحی (نەوحی)
بەکوێری چاوی دوژمن دوو دیدەکەت ئەڕێژا

---

١– دەر: دەرگا.

٢– ئەبرژا: لەدەقی ژمارە (٣)دا نووسراوە (دەبرژا).

## شێوەت بەخوا نایەتە ناو

شێوەت بەخوا نایەتە ناو فیکرەوە حاشا
یووسف[١] کە دیباجەیی[٢] حوسنت[٣] بە تەماشا
یووسف کە ئەوەڵ عاشقی ئەو حەزرەتی یەعقووب
یاقووبی ئەتۆ زۆرە (و لا یُعد و یُحصی)[٤]
لەفزێکی وەها خۆشە بە حیکمەت لە حەدیسی[٥]
دێنێ لە بەهای خەزنەیی سوڵتانی نەجاشا[٦]
سەروێکە لە بەر کەوسەری[٧] قودرەت بە نومابێ[٨]
سوبحانە[٩] چ خۆشە کە، بکەی سەیر و تەماشا
زوڵفی عەبیری خوتەن[١٠] و موشکی[١١] موعەللا[١٢]
بەو سورەتە (والشمس)ـە[١٣] وە دەیکاتە (ویغشی)
شیرینی ئەتۆ دڵبەری، دنیا وەکو فەرهاد[١٤]
پێویستی بە تۆیە لە گەدا[١٥] تاوەکو پاشا
بێستانی ئومێدم گوڵی زۆرە بە حەقیقەت
(نەوحی) بە گوڵێ ئێستا گرفتارە تەماشا

---

١- مەبەست لە "یووسف کوڕی یەعقوب"ـە کە هەردووکیان پێغەمبەر بوون (سڵاوی خوایان لێ بێت)...

٢- دیباجە: دەکرێ مەبەست لە "ڕووخسار، ڕوو، بەرچاو دیار" بێت.

٣- حوسن: جوانی.

٤- لا یُعد و یُحصی: واتە: لەژمارە نایەت.

٥- حەدیس: وتە، باس، قسە.

٦- جاشا: جا، شوێن. بەعەرەبیش واتای (پەشۆکاو) دەگەیەنێت.

٧- کەوسەر: ناوی ڕووبارێکە لە بەهەشت.

٨- نومابێ: ئاشکراببێت، دەربکەوێت، دیاری بدات.

٩- سوبحان: خوا، بەپاکی یادکردنی خواوەند، وتنی (سبُحان الله).

١٠- خوتەن: ناوی کۆنی بەشێك لە تورکستانی خۆرهەڵات یان تورکستانی چینە کە مامزی موشکی ئەوێ بەناوبانگە.

١١- موشك: مسك. ماددەیەکی بۆنخۆشە، لەناوکی مامزی موشك دێتە دەرێ. ئاسکی موشك دوو کەڵبی درێژی وەك دانی فیلی هەیە. (بڕوانە: دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی، لێکۆڵینەوە و ساغ کردنەوەی: دکتۆر مارف خەزنەدار، دار الحریة للطباعة، بەغداد، ١٩٧٧، ل٢٧٥.)

١٢- موعەللا: دەکرێ مەبەست لە "بەرز، بڵند" بێت.

١٣- الشمس: سوورەتێکە لە قورئان، بریتییە لە (١٥) ئایەت.

١٤- فەرهاد: دڵدارەکەی شیرینی ئەرمەنە، داستانە شیعرێکش بەناویانەوە هەیە. لەم داستانە، چوار دەستخەتی کۆن (بەشێوەزاری گۆران)، لەلامان پارێزراوە، کە لەداهاتوودا چاپیان دەکەین...

١٥- گەدا: دەستکورت، نەدار، هەژار.

## ئەگەر ماچی دەمی سوبحت

ئەگەر ماچی دەمی سوبحت لەبیرم چێ لە قەبریشا
بەسەر سەردا بکەم خۆڵی بەری پێی تۆ لە حەشریشا
لەچاوی شارەزام ئەی دڵ مەچۆ بۆ خزمەتی تاکو
لەعیلمی غەمزە[1] تەسنیفی[2] نەکەی شەرحی لە سەبریشا
لەبەر شیرینی لێوی تۆیە لێوم ئێستە بەر نابێ
دڵم نایەتەوە جێگە بە سەد شیشە لە ترشیشا
بەسینەی چاکەوە هاتم بەڕەنگی زەردەوە ڕۆیم
لە ڕۆژئاوای مەراقی بوو ویسالی[3] دی لە شەرقیشا[4]
گڵۆپی کوڵمی کاڵیەتی موتالای پێ ئەکەم ئەمشەو
وەئیللا (نەوحی) ئەم فەننە لەبەر ناکەی لە حەشریشا

١- غەمزە: چاوداگرتنی خانمان بەناز، چاوهەڵتەکاندن.
٢- تەسنیف: پۆلێنکردن "تصنیف".
٣- ویسال: پێوەندی، بەیەکگەیشتن.
٤- شەرق: خۆرهەڵات.

## گەر بەغەمزە بێت و ساقی

گەر بەغەمزە بێت و ساقی پیاڵەیە چا دابکا
دەسبەجێ گیانم بە نەزری[1] بێ ئەگەر ئاوا بکا
چاوی نەرمی تازە هەستاوە لە خەو گیانم فیدای
ئەمری وایە دڵ ببا هەرکەس هەیە زوو ڕابکا
من لە مێژە دڵ براوی چاوی نەرم و کاڵی تۆم
چۆن ئەڕۆم سەر دائەنێم، پێ بنێ بەسەریا ڕابکا
گەر ئیشارەی ڕەمزی چاوی بێنم و شەرحی[2] بدەم
پێم ئەڵێن ئەم خەستە[3] پێویستی شیفای سینا[4] ئەکا
وەرنە سەیری، مێشی دڵ نیشتووە بەشەکری لێوی ئەو
یارەکەی زێڕین بەدەن[5] گوڵخونچە کەی بڕوا ئەکا
گەر درێژی شەو لە چاوی من ئەپرسی پێت ئەڵێ
چونکە شەو ئەستێرەکانی عاسمان تەعدا[6] ئەکا
گەر بڵێم و دەرسی زنجیری دوو زوڵفی مورشیدم[7]
وەر بخوێنم حاشییەم[8] ئەگریجەکەی ئیمزا ئەکا
چونکە کوردم کردەوەم عەشقە وەکو (نەوحی) ئیتر
حەز بە باغی سینگەکەی گوڵخونچە بێ پەروا ئەکا

---

١- نەزر: بڕیاردان لەسەر کارێك "بەتایبەت خێرکردن".
٢- شەرح: شیکردنەوە.
٣- خەستە: نەخۆش، دەردەدار.
٤- سینا: کوڕی ئەبو عەلی ئەلحوسێن کوڕی عەبدوڵڵا (٩٨٠-١٠٣٧ز) فەیلەسووف و پزیشکێکی ناسراوی بەناوبانگە، ئەو کتێبانەی کە دایناون لە (١٠٠) کتێب زۆرترن کە گرنگترینیان لە بواری (قانوون) دایە بە ناوی (في الطب والشفاء) لەفەلسەفەدا و (الاشارات والتنبيهات) لە لۆژیکدا و (اسباب حدوث الحروف) لە دەنگسازیدا.
٥- بەدەن: لەش، جەستە.
٦- تەعدا: کورتکراوەی (تەعداد)ە، ژماردن.
٧- مورشید: ڕابەر، پیری تەریقەت.
٨- حاشییە: مەبەست لە شتێکی "پەراوێزکراو" وە.

## بێنەوە سووتاوە دڵ

بێنەوە سووتاوە دڵ ئیمشەو حەبیبە ناز ئەکا
بۆ بەیانی لەنجەکەی بێ ڕێگە فیتنە ساز ئەکا
گەر لە شمشێری برۆی، ترسم نەبێ چەند حازرم
لابدەم ئەو مەرحەمەی سەر ڕوومەتی فەنتاز[١] ئەکا
ڕوونی سەر کوڵمی نەبێ حوجرەی[٢] دڵم تاریک ئەبێ
گەر چی دڵ بۆ ماچی کوڵمی مەیلی ماچ و گاز ئەکا
لابدە ئەو هەورییە[٣] توو بیو خوا نازك بەدەن
تا موتالای دەرسەکەم کەم لەو خەتەی فەنباز[٤] ئەکا
چۆن لە پاساریی[٥] دڵم ترسم نەبێ هاتە ئەوێ
پێی بڵێ ڕاوی نەکا چاوت کە شێوەی باز ئەکا
کابە کەچ نابێ بە ماچێ باجی جوانیت داوە من
چونکە خەڵقی پێت ئەڵێن ئەو شۆخە خۆی مومتاز ئەکا
هۆشم داناوە لە بارمتەی[٦] شەرابی گەردنت
هەر وەکو (نەوحی) کە سەرخۆشی فیدای چاو باز ئەکا

---

١- فەنتاز: ڕازاوە، نەخشێنراو، شتی جوانی نوێ.
٢- حوجرە: بە زۆری "تاریك و تەنگ" دەوترێت.
٣- هەوری: پارچەیەکی ئاوریشمی ناسکە بۆ سەرپێچی ژنان و ڕووبەند بەکار دێت.
٤- فەنباز: دەکرێ مەبەست لە "فێڵباز، کەڵەکباز، ساختەچی، فێڵاوی" بێت.
٥- پاساریی: بە جۆرێك چۆلەکە دەوترێت "پاستاری، چۆلەکە پاساریی"، بەڵام مەرج نییە شاعیر مەبەستی لە "چۆلەکە" بێت.
٦- بارمتە: شتێك لەباتی شتێکی تر بە ئامانەت دانرابێت، بە مەرجێ بارمتەکە لە شتەکە بە نرختربێت.

## چاوەکەم چاوت بەغەمزە

چاوەکەم چاوت بە غەمزە خانە وێرانم ئەکا
چاوەکەم بۆیە بەگل[1] وەستاوە حەیرانم[2] ئەکا
گیانی من ئێشکچییە بۆ زاغی باغی ڕوومەتت
بۆ وەکو پەروانە خۆی سووتاوی جانانم[3] ئەکا
من نەخۆشی چاوی تۆم دەردی ترم نەبووە
پزیشك بۆ تەداوی[4]، بۆ حەواڵەی داوی لوقمانم[5] ئەکا
تاریکی زوڵفت بەعاستەم[6] چەرخی ڕووتی گرتووە
کافرە چونکە عەزیزم خەسفی[7] سەیرانم ئەکا
زاویەی[8] پڕ جەوهەری جەدوەل کەشی[9] کوڵمت نەبێ
بۆ دڵی (نەوحی) عەزیزم چی پەرێشانم ئەکا؟

---

١- گل: چاوئێشە.
٢- حەیران: ئەویندار، ئاشق.
٣- جانان: کۆی جان: گیان.
٤- تەداوی: تیمارکردن.
٥- لوقمان: مەبەست لە لوقمانی حەکیمە کە لەقورئانی پیرۆزدا ناوی بە زیرەکیی و زانایی هاتووە، لەبواری پزیشکیدا شارەزاییەکی زۆری هەبووە.
٦- عاستەم: ئاستەم، بەحاڵ، کەم.
٧- خەسف: دەکرێ بە مەبەستی "داپۆشین، شاردنەوەی خۆشی" بەکارهاتبێت.
٨- زاویە: گۆشە، سووچ، قوژبن.
٩- کەش: تەرایی زەوی کە دەغڵی پێ بڕوێ. دەکرێ شاعیر مەبەستی لەم دەربڕینە بێت: ئازیزم ئەگەر گۆشەی کوڵمی پڕ ڕەنگ و ئاوداری قەشەنگت نەبێت، چی تر دەتوانێت دڵی نەوحی خەمبار و پەرێشان بکات.

## شەستە بارانی غەمە

شەستە بارانی غەمە گریانە هەردە شین ئەکا
خوێنی دڵ هاتە پلوسکی[١]، دیدەکەم ڕەنگین ئەکا
گەوهەر و مرواری فرمێسکم، ڕژایە بەردەمی
موشتەری گوڵباغی ڕووتم زوڵفەکەی پەرژین ئەکا
مێشی دڵ ڕووکاتە خاڵی شەکری لێوی بێ خەتا
باوەشێنی پەرچەمی لێی ناگەڕێ پەرچین ئەکا
حیکمەتە عەقڵم خەریکە تفلی[٢] دڵ ژیر ئەکا
ڕوو لە باغی ڕووی بکا بۆ خاڵی قاروقین ئەکا
شەشدەری دڵ داخرا ئەمڕۆ بە قفڵی غەم کەچی
دەشتی سارایە بە وەسڵت چاوەڕێی دووربین ئەکا
بۆ گڕی فانۆسی دڵ شەوقی بیابانی هەیە
یادی وەسڵی تۆیە تەئسیری وەکو بەنزین ئەکا
تاقە بەرگی دوو غەزەل کوردی لە بەرکەی تێ ئەگەی
ئارەزووی کوتاڵی دڵ کەی حەز بە قوستەنتین[٣] ئەکا
بەرگی جاوی[٤] خۆم ئەپۆشم حەز بە یاری کورد ئەکەم
نامەوێ (بێگانە قەیفە)ی[٥] باوی ئەفرەنجین ئەکا
تا کە نەیبینێ نە یاری، یاری خۆی لا یارییە
(نەوحی) شیعری تۆیە، کوردی تێگەیی و غەمگین ئەکا

---

١- پلوسك: چۆڕاوگە، مەرزیب.
٢- تفل: منداڵ، منداڵی ساوا.
٣- قوستەنتین (القُسطَنْطَنيّة): شاری (ئەستەمبوڵ)ی ئێستا، کە لەکۆندا پێی وتراوە (قوستەنتین) و تا ساڵی (١٩٢٢ن پایتەختی عوسمانیەکان بووە.
٤- جاو: جانك، تەنراوێکە ڕیسی ئەستوورە و بە خەرەك دەڕێسرێت، ئنجا جۆلا ئامادەی دەکات.
٥- قەیفە: قەدیفە، جۆرە کوتاڵێکی نایاب و بەنرخە، جاران بۆ کەواوسەڵتە بەکاریان دەهێنا.

## پەروەردەیی شەهدو شەککەری

پـــەروەردەیی شـــەهد[١] و شـــەککەری عالـــەمی بـــالاّ
ئـەو شـۆخەیی سەربەسـتی کەمـەر بەسـتەیی مـەولا[٢]
ســـەودازەدەیی گـــوارەیی بـــەر تـــوڕڕەیی[٣] زوڵفـــی
شـــەمس و قەمـــەر و موشـــتەریی و زوهرەیـــە[٤] وەڵـــلا
چـــاوم بـــە خـــەیاڵی خـــەو و گیـــانم ئـــەبڕێ پێـــی
دەســـتم بـــە دڵـــی خـــۆم لـــە قـــەددی ســـەروی دەئـــاڵا
زوڵفـــی کـــە بـــە لا کـــرد و ســـەری خـــاڵی بـــە دەرکـــەوت
ئیـــسپاتە لـــەبۆ جوزئـــو ئیـــشارەی بـــە هـــەیوولا
تـــەعریزی[٥] عـــەریزەم[٦] لـــە نـــەیارت گلـــەیی کـــرد
لـــەو حەزرەتـــە پـــەنهان[٧] نییـــە ئـــەم دەردە بـــە وەڵـــلا
قوببـــەی[٨] کەمـــەری زیـــوو زەڕی فیتنەیـــە بـــۆ دیـــن
شـــێوەی نـــەزەری پـــڕ خەتـــەری قـــابیزە[٩] تـــەللاّ
بـۆ بـاغی گـوڵی سـینە بـە بـێ تەزکـەرە[١٠] (نـەوحی)
قاچـــاغە بـــەڵام بێـــت و بـــچی، ئەرشـــەدەکەللاّ[١١]

١- شەهد: شیرە، هەنگوین، شیرەی خورما.
٢- مەولا: سەروەر، گەورە، سەیید.
٣- توڕڕە: ناوچەوان، ئەو دەستە مووەی کە بەسەر ناوچەوانداا دێتە خوارێ.
٤- موشتەری و زوهرە: دوو ئەستێرەی گەورەن کە لە ئەستێرە گەڕۆکەکانی بنەماڵەی ڕۆژن.
٥- تەعریز: بۆ ئاماژەکردن بە کار دێت، کینایەیە.
٦- عەریزە: ئەرزوحاڵ.
٧- پەنهان: شارلوە.
٨- قوببە: جۆرە خشڵێکی ئافرەتانەیە کە لە پشتێن دەبەسترێت، لە زیو یان زێڕ یان ورشە، ئامادە دەکرێت
٩- قابیز: ئەوەی ڕۆح دەکێشێت، فریشتەی گیان کێشان (حەزرەتی ئیزرائیل).
١٠- تەزکەرە: پلیت، تیکت.
١١- ئەرشەدەکەللاّ: خوا ڕێنومایت بکات، خوا بتخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست.

## که سۆفی بۆ بەهەشت بڕوا

کە سۆفی بۆ بەهەشت بڕوا، منیش بۆ یار دڵم ئەڕوا
لە خوێنی جگەرمە گوڵ وا لە بەر پێیا کەوا ئەڕوا
سەرنجی دەردەکەی دام ئەو پزیشکە هەر ئیشاعەی[1] ڕووی
برینی جەرگمی دەرخست لە سەر کوڵمی بە بێ پەروا
وتی جەرگت نیشانەی شیری ئەبرۆی پێوەیە بۆیە
بە دەرزیی پەنسەلین[2] تیماری پێویستە، بکە بڕوا
لە پرشەی کوڵمی نیترۆنات[3] بە خاڵی قومبەلەی دانا
بە تاقە تیلی چاوێکی دڵی هیرۆشیما[4] بڕوا
منی کوردی نەفامی بێ چەك و بێ پیشە سا چبکەم؟
مەگەر هەر چاوەڕوانی، چاوەڕاوی[5] ئێوە بم هەروا
دەریخە ڕوو وەکو ڕۆژی لە ژێر هەوری خەفەت ڕێژی
بەشەرتێ ڕاستی خۆت بێژی لە غەربی[6]، شەرقی[7]، یا هەروا[8]
ئەوا (نەوحی) لە داخی تێنەگەیوانی وەتەن ڕۆیی
مەگەر هەر قوڕ بپێوێ بۆ خۆی و ئێوەش بژین هەروا

---

١- ئیشاعە: واتەوات، پڕوپاگەندە، بڵاوبوونەوەی دەنگوباس و هەواڵ، کە دەکرێ لێرەدا مەبەست لە ئیشاعەی پزیشکیی بێت کە بۆ دۆزینەوەی جۆری نەخۆشی، دەگیرێت. واتە (من نەخۆش بووم کە ڕووخساری یارەکەم دەرکەوتو بینیم وەك ئیشاعە دەرد و برینەکانمی دەرخست و دەرمانی دەردیشم دۆزرایەوە).

٢- دەرزی پەنسەلین: شریقەی پەنسەلین بۆ تەشەنە و هەوکردنی برین و زام دەدرێت لە تووشبوو.

٣- نیترۆنات (نیوترۆن): تەنێکی هاوکێشە لە ناوکی گەردیلە دایە، بۆ دروستکردنی بۆمبی نیوترۆنی بەکار دێت.

٤- هیرۆشیما: مەبەست لەو شارەی وڵاتی یابانە کە لەجەنگی دووەمی جیهانی و لە ڕۆژی (١٩٤٥/٨/٢ز)دا بە چەکی ئەتۆمی بۆردوومان کرا و هەزارەها کەس بوون بە قوربانیی ...

٥- چاوەڕاو: دەنگوباس و پڕوپاگەندەی باش. (چاووڕاو)شی پێدەڵێن.

٦- غەربی: خۆرئاوایی.

٧- شەرقی: خۆرهەڵاتی.

٨- هەروا: مەبەست لە ئاسایی، واتە: خۆتم لێ ئاشکرا بکە.

## له پاش دەردی جیایی

لەپاش دەردی جیایی نانوێنێ میحنەتی[١] هەر وا
له ئاو گەر دوور کەوێ ماسی لە ئاگر کەی ئەکا پەروا[٢]
ئەڵێن خۆڵی دەری مەیخانە سورمەی چاوە بۆ عاشق
بەڵێ ڕۆژێ ئەگەر جارێ حەبیبە[٣] بێ بەوێ بڕوا
گەلێ غوسسەو[٤] غەمم دیوە بەڵام نابێتە دووری ئەو
لە بەر پێی دائەنێم گیانم نەوەك ماڵم وەکو سەروا[٥]
جیایی باعیسی[٦] کوژانەوەی فانۆسی وەسڵە خۆ
بە تەنیا خۆم ئەسووتێنم کە گیانیشم لە پێ[٧] بڕوا
شکایەت ناکەم و ناڵێم لە دنیا میحنەتم دیوە
وەکو (نەوحی) ئەگەر دەستم بگاتە دامەنی هەروا

---

١- میحنەت: چورتم، دەردەسەری، کۆست.

٢- پەروا: ترس.

٣- حەبیبە: خۆشەویست، دڵخواز. خۆشەویستەکەی "نالی" شاعیریش هەرناوی "حەبیبە" بووە.

٤- غوسسە: خەم و پەژارە.

٥- سەروا (سەروە): جولمێر و چاوتێر، دلێر، دڵفراوان.

٦- باعیس: هۆ.

٧- پێ: کورتکراوەی (پێناو)ە، واتە: گیانی خۆم بە تەواوی لە پێناویدا دەسووتێنم.

## مەقسەدی دڵ دایما

مەقسەدی دڵ دایما بۆ چاوی کاڵی بوو کەوا
دڵ بە داغی سینە، باغی خەتتو خاڵی بوو کەوا
عەقڵ و هۆش و زەین و بیرو فام و تەبعی[1] دڵ هەموو
گیری داوی زوڵفی خاوی تیر و تاڵی بوو کەوا
بەفرو خوێنە روومەتی عاشق کوژە ئەو دڵبەرە
چەندێ وەك (سەحبان)ی[2] دایم (صمٌ[3]) لاڵی بوو کەوا
ڕێگری دینە لە مێژێ، ئەو لەبۆ، یار و نەیار
جەردەیی سەبر و تەحەممول خەتتو خاڵی بوو کەوا
بۆ برینی جەرگی (نەوحی) خۆڵی بەر پێی پێ ئەوێ
گەرچی دنیا پایەماڵی[4]، پڕ جەماڵی بوو کەوا

١– تەبع: نەریت، ڕەفتار.
٢– سەحبان: پیاوێکی ژیرو ڕۆشنبیرێکی عەرەب و خەڵکی (وائیل) بووە، واتە: ئەو دڵبەرە ئەویندارکوژە، چەندین کەسی وەك (سەحبان)ی چیر و زانای کەڕو لاڵ کردووە.
٣– صمٌ: کەڕ، ئەوەی کە نابیستێت.
٤– پایەماڵ: لەناوبراو، فەوتێنراو، خاپوور.

## ماچی زەکاتی دەمی

ماچی زەکاتی دەمی، گەیوەتە حەددی نیساب[1]
خۆش خەبەرێکە لەبۆ گیان و دڵ و دەم بەتاب[2]
تاکو گرەی[3] زوڵفی تۆ یانی بە ئەگریجەت[4]
بەندی نەکا گیانی من ناگەیە حەددی موساب[5]
گۆشەیی ڕووتە وە یا ڕۆژە لە ژێر هەوریا
شین و گرین کەوتە نێو ئەهلی سەفاو و عەزاب
سۆفیش لە مەیخانەکەی خانەقا ئاوا ئەکا
تازە کە بەرماڵەکەی بارمتەیە بۆ شەراب
دڵ بەچی پاراو[6] ئەبێ؟ ئارەقی سەر کوڵمی یار
چاوی خوماری بە شەو نازەوە خاوەن عیتاب[7]
ڕووت کە هەڵات ئاسمان چۆڵە لە مانگو لە خۆر
پاکی هەڵات و نەما ئەستێرەو ئەنجوم[8] بە تاب
چاوی هەڵۆیی لەگەڵ جووتێ برۆی مینبەری[9]
مەیکەدە ئاوا ئەکەن، کابەیە ئەیکەن خەراب
تیپ و سەفی لە شکری چینی دوو زوڵفی شەوی
پاکی بە سوننی لەوێ حازری ئەمری جەناب
ئاگری ڕووتم هەیە قیمەکێشە[10] هەردوو برۆت
جەرگ و دڵی (نەوحی) یە تازە ئەبێتە کەباب

---

١- حەددی نیساب: ڕاددەی خۆی، بڕ و ئەندازەی زەکات لێدان.

٢- تاب: هێز، توانا.

٣- گرە: گرێ.

٤- ئەگریجە: بسك، مووی سەر لاجانگ.

٥- حەددی موساب: ڕاددەی بەڵا و نەگبەتی، پلەی تووشبوون.

٦- پارلو: تێرلو.

٧- عیتاب: گلەیی.

٨- ئەنجوم: کۆی (نەجم)ـە، ئەستێرە.

٩- مینبەر: میمبەر، جێگەیەکی تایبەتە بە وتار خوێندنەوە لە مزگەوتدا.

١٠- قیمەکێش: چەپەچاخ، پارچە ئاسنێکی دەم تیژی دەسکدارە، گۆشتی پێ ورد دەکرێت. لە هەندێ لە دەستخەتەکاندا نووسراوە (قیمەکەش).

## خوێنی جگەر و زووخی دلی من

خوێنی جگەر و زووخی[1] دڵی من چ مورەتتەب[2]
دەتکێتەوە لەم چاوە، وەکو سورخ و[3] مورەککەب[4]
نووسی خەتی خاڵی لە دڵم شێوەیی دووری
سەد دەفعە لە لای ئەهلی وەفا بۆتە موجەڕڕەب[5]
کەسپی لە دڵم کردووە زوڵفت بە هەموو تەرز[6]
تەرکیبی خەیاڵاتی موشەوەش چ مورەتتەب
غایاتی لە ئیزهاری[7] سەبەب قودرەتی خۆی بوو
شاهید نییە بۆ عیللەیی[8] ئەنواعی موسەببەب[9]
سەتحی[10] دڵی من بوو وەکو سەحنی[11] چەمەنی چین
ئێستا بە غەمی تۆ لە دووسەد لاوە موحەددەب[12]
شاهید نییە بۆ زیددی[13] کەماڵاتی[14] ویساڵت
ئەی من بە فیدای پەنجەیی شمشاڵی موخەززەب[15]
تۆ خەرقە[16] بسووتێنە لە بەر قوڵقوڵی شووشە
بەم تەرزە لە لای پیری موغان بویتە موقەڕڕەب[17]
مەوزوعی سیاساتی مەراقە دڵی (نەوحی)
حەملی[18] غەمی سەد بارە لە ئەم قەزیە مورەککەب

---

١- زووخ: خوێن و کێمی دومەڵ و برین.
٢- مورەتتەب: ڕێکخراو، هەرشتێ بەڕێکوپێکی ئامادە بکرێت.
٣- سورخ: ڕەنگی سوور، ڕەنگی شەرابی.
٤- مورەککەب: ئاوێتە، تێکەڵاو، لە نیوە باڵی دووەمی دوا خشتیشدا دووبارە کراوە کە ئەمە لە دەستووری وێژەدا، ڕەوا نییە.
٥- موجەڕڕەب: تاقی کەرەوە.
٦- تەرز: شێوە، جۆر.
٧- ئیزهار: دەرخستن، ئاشکراکردن.
٨- عیللە: هۆ.
٩- موسەببەب: هۆکار.
١٠- سەتح: ڕوو، بان.
١١- سەحن: حەوشە، گۆڕەپان، دیواری بەرز و گەورە بە دەوری بێستان و باخچەدا.
١٢- موحەددەب: قۆقز، دەرپەڕیوو، واژووی قووڵ و چاڵە.
١٣- زیدد: دژ، لە (ضد)ی عەرەبییەوە هاتووە.
١٤- کەماڵات: کۆی (کەماڵ)ـە، تەواو، بێ کەموکوڕی.
١٥- موخەززەب: سوورهەڵگەڕاو.
١٦- خەرقە: باڵاپۆشی دەروێش.
١٧- موقەڕڕەب: نزیک بوون لە کەسێک.
١٨- حەمل: بار، ئەوەی بارەبەر دەیبا، کۆڵ.

## داوی نه کرژی سەری زوڵفی

داوی نەکرژی سەری زوڵفی خەیاتەی[١] حەبیب
ڕاوی دڵ و دین ئەکا خاڵی لە بەرز و نەشیب[٢]
مورغی[٣] خەیاڵم شەوێ هات و گەیشتە ئەوێ
چاوی بە تیری مژە کوشتی لەوێ بێ نەسیب
شاهێنە[٤] چاوت وەیا شایەنە[٥] وا سەر ئەکا
کافرە مەنعی دەوا شاهیدە ناکا تەبیب
تیشکی سەری ڕووتە یا پرتەوی[٦] خورشیدە[٧] یا
پۆلی فریشتەی سەما دێنە جەنازەی غەریب
پرسەیە سابۆ شەهید شینە چەمەن سوورە باغ
غەمزەیی چاوت کەوا مۆڵەتی نادا عەجیب
ئاخی دڵی سەردی من داغی گوڵی کوڵمی تۆ
کەوتۆتە بابی مەحاڵ بۆیە بە شەوقە ڕەقیب[٨]
(نەوحی) غەوواسە[٩] لە نێو بەحری غەمی عەشقی ئەو
شەرتە کە زنجیر نەبێ غەیری بە زوڵفی حەبیب

---

١- خەیاتە: کشتەکی ئاوریشم، دەزووی ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ (زوڵفت خەیاتەی خاوە).
٢- بەرزونەشیب: هەوراز و نشێو.
٣- مورغ: پەلەوەر، باڵندە.
٤- شاهێن: جۆرە مەلێکی ڕاویە لە باز دەکات.
٥- شایەن: شاهێنی تەرازوور.
٦- پرتەو: ڕووناکی ڕۆژ.
٧- خورشید: ڕۆژ، خۆر، هۆر.
٨- ڕەقیب: نەیار، ناحەز.
٩- غەوواس: مەلەوان، ئەوەی دەچێتە ژێر ئاو.

## سەخت و ناهەمواره ڕێگەی

سـەخت و ناهـەمواره ڕێگـەی ڕەمـزی غـەمزەی حیکمـەتت
بـاغی دڵ ڕازاوەیـە ئـەمڕۆ بـە جـوانی و شـەوکەتت
هەرکەسـێ پێوەنـدی[1] زوڵفـی تـۆی لـە گەردنـدا ببـێ
زیرەکـە بـۆ ئـەو نـەیارەی بـێ بەشـەی بـێ نوسـرەتت[2]
ئـەو کەسـە وا تـۆی نیـشانداوه بـە ڕەمـزی کائینـات[3]
هـەر وەکـو مـن دەسـتە ئەژنۆیـە لـە داغـی ڕوومـەتت
ڕووم نییـە بێمـە حـوزوور بۆیـە ئـەناڵێنم لـە دوور
غـەمزەدەی دیـداری تـۆم و تینـووم بـۆ وەسـڵەتت[4]
ناحـەزی (نـەوحی) لـە لایـە تـیری چـاوی تـۆ لـەلا
یـا (حیـسامەددین)[5] پـەنام هێنایـە بـاغی غیرەتـت

---

١- پێوەند: پێوەن، ئەو زنجیری دەکرێتە دەست و قاچ.
٢- نوسرەت: پشتگیری، یارمەتی، کۆمەکی.
٣- کائینات: بوونەوەر.
٤- وەسڵەت: پەیوەندی، بەیەك گەیشتن.
٥- حیسامەددین (١٨٦٢- ١٩٣٢ز): کوڕی شێخ محەممەدی بەهائەدینە. ناوی (عەلی)یەو خەڵکی تەوێڵەیە. سۆفییەکی بەناوبانگی ڕۆژگاری خۆی بووە.

## واهاته بەری خێوەتی دڵ

وا هاتـــە بـــەری خێـــوەتی[1] دڵ پـــۆلی خـــەیاڵت
عـــەقڵ و ئـــەدەبم کـــردە فیـــدای نـــەرگزی کاڵـــت
ســـیمورغە[2] دڵ و هۆشـــی ئـــەمن هاتـــە ســـەری ڕوو
پێبەنـــدە بـــە زوڵفـــت بـــە تـــەمای دانـــەیی خاڵـــت
گـــیراوی ڕوخـــی[3] تۆیـــە شـــاهی[4] عـــەقڵی مـــن ئێستە
تـــەدبیری وەزیـــرم نییـــە بـــۆ کـــوڵمی وا ئاڵـــت
سەرداره دڵـی مـن لـە هـەموو موڵکی تـۆ هـەر پێنج
زوڵـــف و ڕوخ و خـــاڵ و خـــەتت و ئـــەبرۆیی هیلالـــت
بـاکم چـییە خـەڵکی کـە هـەموو دوژمنـە (نـەوحی)
خـــۆ دیوتـــە حەبیبـــە بـــە تەماحـــە بـــە ویـــساڵت

---

١- خێوەت: ڕەشماڵ، چادر.
٢- سیمورغ: سیمرغ، سیمر، باڵدارێکی خەیاڵییە.
- ڕوخ: ڕوو، چارە، ڕوومەت، کوڵم.
٤- شاه: سوڵتان، خاوەنی تەخت و تاج.

## جەردەی دل و دین

جەردەی دڵ و دین غەمزەیی دوو چاوی غەزالت
مەیرێژە بە کل جوانە کە ئەو دیدەیی کاڵت
دڵ زامی زەدەی[1] دەستی پەری ڕووتە عەزیزم
دێوانەیە خۆ چاری نییە، شێتی ویساڵت
سەودا سەری تۆم، مەمخەرە بەر باری مەراقت
کوژراوی بڕۆتم بە فیداتم بە جەماڵت
دڵبەر کە پزیشکی هەموو دەردی دڵی من بێ
باکم چییە بۆ زەهری[2] غەم و دووری مەلالت[3]
تایێ لە دوو زوڵفت دڵی سەد عاشقی پێوە
مێشی دڵی خۆم، گیرە بە شەهدی لەبی[4] ئاڵت
(سەرو)[5] و سەمەن[6] و لاله[7] لە بەر قەدد و لەش و ڕوو
ژاکاو و شکاوە هەموو ڕوو زەرد و خەجاڵەت
دڵ وا لە بەری تیری مژە و سەر لە بەری پێت
(نەوحی) بە تەما ماوە لە سەیرانی جەماڵت

---

١- زەدە: نەنگ.
٢- زەهر: ژەهر.
٣- مەلال: مەلوولی، دڵتەنگی، بێزاری.
٤- لەب: لێو.
٥- سەرو: دارێکی ڕاست و بێبەرە.
٦- سەمەن: گوڵی یاسەمەن.
٧- لاله: مێلاقە، ڕەبەنۆک، گوڵاڵە سوورە.

## له باغی دڵ ئەنێژم

لە باغی دڵ ئەنێژم قەددی لاوت
بە وشکی مشکی[١] و هەوری کەچ[٢] کڵاوت
ئەگەر شابازی[٣] دڵ خۆ بێتە مەیدان
ئەگێڕێ زوو بە دوای زوڵفی خاوت
لە خێوی وەفا، مەعلومە ئەمڕۆ
فرۆشتم دین و دڵ بۆ ڕەسمی چاوت
ئەگەر ئەو دلبەرە ئارەق فرۆشە
لە بارمتەی ئەنێم ئاین بە چاوت
سەرم دانا بە شاباشی پەیامت
وەکو (نەوحی) بە یادی قەددی لاوت[٤]

---

١- مشکی: جۆرێ پارچەی ئاورێشمە، کە دەکرێتە پێچی سەر.

٢- کەچ: خوار، لار، کەچ کڵاو، کڵاو لار.

٣- شاباز: بازی سپی، مەلێکی ڕاوچی بە ناوبانگە.

٤- تەنیا لە نامەیەکدا نووسراوە (لێوی سووراوت).

## هەموو دنیام لە سەر تۆ بوو

هەموو دنیام لە سەر تۆ بوو بە دوژمن تۆش بەدینی خۆت
رەقیب گەرچی لە سیحرو دام و تەزویرە ئەبینی خۆت
لە شەو، گەر رۆژی کولمت دەربخەی بۆ من ئەڵێم ئیتر
بەهەشتیم و ژیانم مایەدارە بۆ شوێنی خۆت
بە واتەی بەد بەڵێ چاوم مەکە حاشا مەکە بڕوا
کە چونکە گەلێ[1] بە ناسۆرە دڵم هەر بەو برینی خۆت
ئەگەر خۆ بمکوژی ئەمڕۆ وەکو جەرگت بڕیم ئەمجا
ئەتۆ موختار[2] و من مەمنوون خەتا بۆ چینی زوڵفی خۆت
گەلێ مەمنوونە ئەم خەستە ئەگەر پرسی هەواڵی ئەو
کە تۆ چونکە حەبیبی هەم تەبیبی بۆ برینی خۆت
ئەترسم بمکوژی و دەستت بێشێ و من خەجاڵەت بم
کە چونکە حەددی[3] تەکلیفت نییە هێشتا بە دینی خۆت
ئەمن جەرگم بە داغی خاڵی کولمی ئاگرینت سووتا
وەکو(نەوحی) کە زنجیرە بە زوڵفی پەرچەمینی خۆت

---

١- لە هەندێ دەستخەتدا نووسراوە (زۆر).

٢- موختار: سەرپشك.

٣- حەدد: سنووردانان بۆ کەسێك.

## ئەی بادی سبەێنی وەرە

ئەی بادی سبەێنی وەرە وا مانگی گوڵان هات
وا بۆنی گوڵ و ئاخی دڵ و سۆزی بەیان هات
ئەم نامە بە کوردی ببە بۆ خزمەتی یارم
بەو یارە بڵێ بێت و نەیێ، عەینی نەهات[1]، هات
چەند موددەیە من چاوەڕێی پێش قەدەمی[2] بووم
هەتتاکە دڵم خۆی بە چەپەر چەن بەنیهان[3] هات
ساقی وەرە جامێ بدە لەم مەجلیسی دارا
لەم خۆشییە یارم بە کەوا و تاجی کەیان هات
بۆم تێکە بەیادی سەری شمشێری برۆی خۆی
من شەو بە تەما بووم و کە وەك تیر لە بەیان هات
جەرگم هەموو وا پارەیە[4] بۆ زرنگەیی پیاڵەت
چون[5] دڵبەری بێ ڕەحم و وەفای سەر بەقڕان هات
موتریب وەرە لێدە بە (علی الرغم)ی حەسوودان[6]
بۆ (نەوحی) دووبارەکە ئەڵێی سوورەتی جان[7] هات

---

١- نەهات: ساڵی گرانی و نەبوونی ساڵی کەم بارانی کە دەبێتە هۆی کەم بارانی و نەهاتی. واتە: ئەگەر یارم تەشریف بۆ لام نەهێنێت، بۆ من دەبێتە ساڵی نەهات و نەبوونی.

٢- پێش قەدەم: پێوقەیەم، واتە: وا ماوەیەکە چاوەڕوانە یارەکەی تەشریفی بهێنێتە لایی و دڵخۆشی بکات.

٣- نیهان: نهێنی، شاراوە.

٤- پارە: لەت، پارچە.

٥- چون: کورتکراوەی (چونکە)یە.

٦- (علی الرغم)ی حەسوودان: بە کوێرایی چاوی حەسودان.

٧- سوورەتی جان: ئاماژەیە بۆ سوورەتی (الجن) لە قورئانی پیرۆزدا کە بریتییە لە (٢٨) ئایەت، جان: جن، جنۆکە.

## له بۆنی عەتری لێوی

لە بۆنی عەتری لێوی کاڵی یاقووت[1]
بکە داوای ژیانی گیانی خۆت قووت[2]
خەزێنەی گەوهەری فرمێسکم ئەکرێ
لەخوێنی دڵ لەبۆ ئەو لەعلە[3] وا سووت
فەلەك سەبیاسە[4]، نەجارە ئەتاشێ
لەبۆ یەك تەختی زەڕ، بۆ یەکێ تابووت[5]
ئیدارەی ژینی دنیا هەر درۆیە
لیباسی عەقڵ و تەبعە[6] زیدد و ناجووت
لە مەیخانەی مەراقی بەحری هیجرەت
هەموو سەرخۆش و غەرق و پەست و نابووت
حەرامە ناوی کەوسەر گەر نەخوێنێ
لە سەر ئەو کەو لەب و ڕەندێکی[7] پەرپووت
بەیادی عارەقی ڕووی تۆیە هێشتا
لەچاهی[8] میحنەتیدا[9] ماوە هارووت[10]
لە ماڕووت گەر ئەپرسی، واپێت دەڵێم[11]
وەکو (نەوحی) بە ڕووتی، ماوە بۆ ڕووت

---

١- یاقووت: بەردێکی بەنرخە، زیاتر لە ڕەنگێکی هەیە (سوور، زەرد، شین، سەوز، سپی).
٢- قووت: خۆراك، خواردەمەنی.
٣- لەعل: یەکێکە لە بەردە بە نرخەکان، ڕەنگی سوورە.
٤- سەبیاس: پیشەوەر، بەڕێوەبردن، هەڵسوڕانی کاروبار.
٥- تابووت: دارەتەرم.
٦- تەبع: خوو، ڕەوشت.
٧- ڕەند: پیاوی پیاوانە، کەڵەمێرد، مێرخاس.
٨- چاه: چاڵ، بیر.
٩- میحنەت: چورتم، مەینەتی، دەردەسەری.
١٠- هارووت: ناوی یەکێکە لە دوو فریشتە (هارووت و ماروت) ئەمانە تووشی غەزەبی خوا بوون و خوا لە بیری (بابل)دا سەرنگوونی کردن. لە قورئانی پیرۆزدا ناویان هاتووە.
١١- وا پێت دەڵێم: لە هەندێ دەستخەتدا نووسراوە (مانە بۆ ڕووت).

## چاوی کەژەڵ و گەردنی ئاهوو

چاوی کەژەڵ[1] و گەردنی ئاهوو[2] بە سیاسەت
وێرانی ئەکا مەدرەسەیی عیلمی فیراسەت[3]
نوسخەی خەتی کوڵمی مەکە وێنەی وەکو ڕۆژی
نایێتەوە تەخمینی[4] جەماڵی بە کیاسەت[5]
زانا ئەوەیە واریسی[6] مەجنوونە[7] کە تازە
کەوتۆتە سەری شێخ و مەلا فرتی[8] سیاسەت
خاڵی شەوە، زوڵفی شەوەیە[9]، ڕوومەتی ڕۆژە
مەوجوودە نەقیزەین[10] و مەحاڵە بە قیاسەت
چاوت ئەمنی کوشتووە، بێژە بە نەیارت
پێویستی چییە (نەوحی) مەخە داوی سیاسەت

---

١- کەژەڵ: کەژاڵ، کاڵ.

٢- ئاهوو: مامز، ئاسک، ئاسی.

٣- فیراسەت: ڕووکەش زانی، هەستێکە لە دڵدایە و بەرانبەر یەکێك دروست دەبێت و لە واقیعشدا کتومت وەك خۆی دێتە دی.

٤- تەخمین: قەبڵاندن، گوترە.

٥- کیاسەت: زیرەکی، هۆشیاری.

٦- واریس: میراتگر، جێگر.

٧- مەجنوون: قەیسی عامری، خەڵکی نەجد بووە، پلەی خۆشەویستی بەرامبەر بە لەیلای ئەوینداری وای لێکردووە خەڵکی بە شێتی بزانن.

٨- فرت: دەرچوون و هاتنی بە پەلەن جرت و فرت.

٩- شەوە: بەردێکی ڕەشی بەنرخە، لەم بەردە " مووروویی شەوە" ئامادە دەکرێت.

١٠- نەقیزەین: پێچەوانەی یەك، دوو کاری جیاواز و لەیەك نەچوو.

## حەوزی کەوسەر تەختی مەڕمەڕ

حەوزی کەوسەر تەختی مەڕمەڕ گۆی زیوین فەووارەکەت[1]
دەوری باغی پەرتەقاڵ و سێوی سوور و نارەکەت
سەیری چەتری تاوسی زوڵفت بکە نازک بەدەن
وا لە بەر دەرگی بەهەشتی ڕوومەتی گوڵزارەکەت
هەورییە یا مشکییە، واڕۆژی ڕووی تۆی گرتووە
لای بدە با دەرکەوێ چاو و برۆ و هەم زارەکەت
نەشتەر ئازێنی دڵم، بۆچی ئەکەی ئەی بێ وەفا
من کە کوژراوم بە غەمزەی چاوەکەی بیمارەکەت
سەیری تەسویری بە هەشتی ڕوومەتی خۆت کردووە
ئافەتی[2] دینە بە وەڵڵا سەرخەتی پەرگارەکەت[3]
گەر زەکاتی خەرمەنی سووری[4] دوو کۆڵمت دەربکەی
موستەحەق ئەمڕۆ منم بۆ ماچی دەوری گوارەکەت
تۆ بە لەنجەی کۆتری واپێ بەسەر چاوم مەنێ
نەک برینـدار بێ بە بـرژانگم دوو پێی نازدارەکەت
(نەوحی) کوژراوە بە تیری غەمزەیی چاوی ئەتۆ
تەرمەکەم داپێچە بەو پەلکەی وەکو ڕەشمارەکەت

---

١- فەوولر: هەڵچوو، هەڵدەچێت.
٢- ئافەت: ئافات، دەردوبەلا، ڕووداوی دڵتەزێن.
٣- پەرگار: چاپووک، گورجو گوڵ.
٤- خەرمەنی سوور: خەرمانی سوور، کۆگەنمی خەرمان.

## خاکی بەری پێتم بەخوا

خاکی بەری پێتم بەخوا تاکو قیامەت[1]
گیانم کەمە شاباش زارو شیرین کەلامت[2]
شەو لادە لە سەر ڕوومەتی ڕۆژت بەفیدات بم
خاڵت وەکو پەروانە[3] و زوڵفت کە بە دامت[4]
دڵ وا لە سەر ئەو سوخمەیە سەدەف[5] بۆ[6] نە شکێنێ
بۆ گەوهەری مەم تاقە لە بەر جووتێ شەمامەت
تاکەی لە غەمی تۆ وەکو دێوانە عەزیزم؟
ڕووکەم لە هەموو چۆڵ و بیابانی نەدامەت[7]
هەر چەندە گورفتاری بەلای زاری نە یارم
ئەمجارە دڵم خۆشە کە پێ بەندە بە دامت
چاو کاڵ و برۆ تاڵ و، بە لێو ئاڵە ئەو ئێستا
با بمکوژێ ئەم ڕۆحە چییە گیانی سەلامەت
وا چاکە بە دڵ بێمە وەتەن نەك بەسەر و پێ
وەك (نەوحی) کە دڵخۆشە لە لادێ بە پەیامت

---

١- قیامەت: ڕۆژی دوایی، هەستانەوە.
٢- لە هەندێ دەستخەتەکاندا بەم جۆرە هاتووە (گیانم کەمە شاباشی قەدت کاتی قیامەت).
٣- پەروانە: پەپوولە.
٤- دام: داو، تەڵە.
٥- سەدەف: قالك، شتێکی سپی و ڕەقی بریقەدارە، بە زۆری دوگمەی لێ دروست دەکرێت.
٦- لە دەستخەتەکاندا، بەشێوەی (چۆن+بۆ) هاتووە.
٧- نەدامەت: پەشیمانی.

## وا موژدەیە بۆ ئەهلی دڵ

وا موژدەیە بۆ ئەهلی دڵ ئێستاکە حەبیب دێت
بۆ چارەیی دەردی دڵی ئێمە کە تەبیب دێت
قاسپە وەکو کەو لەنجەیی وەکو کۆتری ماڵی
سەد دڵ لە بەری پێی چ بە ڕەوتێکی نەجیب دێت
بێ مەی بەخوا تامی نییە مەجلیسی ئەمشەو
بێ دیتنی موتریب نییە شەوقی کە لەبیب[1] دێت
ئەو پەڵپە کەگرتوویە لەبۆ گیانی من ئێستا
تەنها لە سەفەر خەستە بە ئومێدی تەبیب دێت
ڕووت ڕۆژە کە داپۆشە بە هەوری ڕەشی گوڵگوڵ
تۆ بیت و خوا فیتنەیە ئەو چونکە ڕەقیب دێت
کەم غەمزە فرۆشبە بە فیدای لەعلی لەبت بم
ترست لە خوا بۆچی نییە ڕۆژی حەسیب[2] دێت
سۆزو دڵ و ناڵەی شەوو ئاخێکی سبەینێ
(نەوحی) لە غەمی تۆیە لە بەر دەربێ نەسیب[3] دێت

---

١- لەبیب: ژیر، زرنگ، ئاقڵ.

٢- حەسیب: پرسینەوە، ڕۆژی ئاخیرەت.

٣- نەسیب: بەش، شانس.

## ڕووت کە ئاڕەنگی ئەدا

ڕووت کــە ئــاڕەنگی[١] ئــەدا وەمزانییــە پــشکۆیە بــۆچ
گرپــە گرپــی خــستە دڵ بۆیــە ئەســووتێ قرچــە قــرچ
تــیری برژانگـــی وەکـــو ســونی بـــەڕیز هاتوونـــە دەر
لێــی گــەڕێ بــابیبڕێ شــیعەی دڵــی مــن خرچــە خــرچ
خـــاڵی دڵ ســـــووتێنە زوڵفـــی باوەشـــێنی کارەبـــا
ئالــەتی ئــەم کــارە بــا هــەر دڵ بهــاڕێ کرچــە کــرچ[٢]
ســاقی چــایی خــۆی ئــەگێڕا، خۆیــشی چــاوی ئــەگێڕا
ئــەو منــی دی خــۆی نەمیــدی بۆیــە کەوتــە پرچــە پــرچ[٣]
چــووم لــە بــاغی دڵبــەرا گوڵــچینی بــاغی بــووم لــە دوور
دەنگی ناحــەز هاتــە گوێم (نــەوحی) بــوو کــردی مــاچ و مــۆچ

١- ئاڕەنگ: ڕەنگ، گەشانەوە.
٢- کرچە کرچ: قرچە قرچ، دەنگی شکاندنی شتی ناسک.
٣- پرچەپرچ: جموجووڵ، جووڵەی نائاسایی.

## کەسپی دوو جیهانم کە هەموو

کەسپی دوو جیهانم کە هەموو سەرفی غەمت کرد
گیان و دڵ دینم بە فیدای ناوی دەمت کرد
کاتی تەرەب[1] و کەیفی دەماغ و لەبی ئەڵوەند
ئەی مەرهەمی دەردم لە دڵم چەند ئەلەمت[2] کرد
ئەمڕۆ کە ئەبینم دەری مەیخانەکە چۆڵە
فنجانی بلوورینە لە سەر سینە جەمت کرد
هەر چەندە کە دووری لە دڵ و دیدەیە وێنەت
ئومێدی دەوای ڕێشی[3] دڵم بوو ستەمت کرد
وا مەسڵەحەتە دەوری بکەین بابی[4] تەنازوع[5]
ئەمڕۆ لە دڵی(نەوحی) عەجەب سەلبی[6] هەمت[7] کرد

---

١- تەرەب: خۆشی، شادی، بەزم.
٢- ئەلەم: ئێش و ئازار.
٣- ڕێش: برین، زام.
٤- باب: بەش.
٥-تەنازوع: ناکۆك بوون، کێشە، مەبەستی شاعیر لە نزیك بوونەوەیە.
٦- سەلب: ڕووتکردنەوە.
٧- هەم: خەم، پەژارە.

## بەو چاوە شەهێنە

بەو چاوە شەهێنە کە ئەبینی نەزەری کرد
چەند تیری مژەی هات و لە قەلبم گوزەری کرد
لێدە بە خەفەت موتریبی سەر پەنجە خەناوی
کاتی تەرەب و عەیش و نەشاتم هەدەری کرد
وەك بێشکەیە بۆ پەروەری منداڵی غەمی تۆ
ئەم دڵمە نەوەك مەنقەلەیە[١] پڕ شەرەری[٢] کرد
چەند دوکتۆری حازیق[٣] بە سەر ئەم جەرگە برینە
هات و کە عیلاجێکی نەبوو زامیّ تری کرد
بەختی ئەمن و تاری شەوو زوڵفی یار[٤] لوولە
هەرسێکی بە سەر پشتی ڕەشماریّ کە ڕێی کرد
شەوخێز[٥] و شەڕەنگیزە[٦] دڵم قرچە ئەکات وەك
بۆتە کە تەلاو[٧] زیوی لە نێودا زەرەری کرد
وا (نەوحی) لەنێو چۆمی غەما چەن مەلەوانە
جەرگی کە نیشانەی مژەیە بۆ خەتەری کرد؟

---

١- مەنقەلە: مەقاڵە، کوورەی ئاگر.
٢- شەرەر: پریشك، پزیسك، پرشنگ.
٣- حازیق: شارەزا.
٤- لە هەندێ شوێندا نووسراوە (کە).
٥- شەوخێز: شەوبێدار، کەسێ لەشەودا ناخەوێت.
٦- شەڕەنگیز: ئاژاوەگێڕ، بەئاشووبە، شەڕانی.
٧- تەلا: زێڕ

## ئەو یارە وتی چۆنی

ئەو یارە وتی: چۆنی ئەی خەفەتبار
وتم: دەردم بەبێ دەرمانە ئەی یار
وتی: ئێستە نەیارت چەندە زۆرە؟
وتم:هێندەی نیشانەی سەر لە بی یار
وتی: هیوامە دەردت چارە بکرێ
وتم: کەیفی خۆتە ئەی دۆستی ئەغیار[1]
وتی: تەبعەن ئەمن دۆستم گەلێکە
وتم: تۆی دوژمنی کوردی وەفادار
وتی: بۆ شێتی وا کەوتویتە کێوان؟
وتم: لەو ڕۆژەوە دوورم لە گوڵزار
وتی: نایەیتەوە بۆ (باغی کۆنە[2])؟
وتم: زاتەن[3] خەیاڵم بوو وەکو پار
وتی: غەڵەتێ گەورەت کرد هەتیو تۆ
وتم: ئەستەغفیروڵڵا دوو هەزار جار
وتی: دووری ئەمن، جەرگی بڕیوی
وتم: هۆشیشی لێ سەندم بەکردار
وتی: (نەوحی) خەیاڵ و ڕابیتەم کە
وتم: تاکەی؟ وتی: تا ڕۆژی هاوار

---

١- ئەغیار: بێگانە، ناحەز.

٢- باغی کۆنە: ئامازەیە بۆ ئەو باخە کۆنەی کە لە تەوێڵەدا ئارامگەکەی شێخ حیسامەددین تەوێڵەیی تێدایە.

٣- زاتەن: بوێرانە، نەترسان.

# ڕۆژی وەرگێڕاو و ئاڵۆزم

ڕۆژی وەرگێـــڕاو و ئـــاڵۆزم ئـــەوێ وەك زوڵفـــی یـــار
تـــا بـــە كـــامی دڵ بـــەكاتی ڕابـــوێری كـــوردەوار
ئارەزوومـــە گـــەل ببێكـــێ دەســـتەیی جـــەنگاوەران
وەك بـرۆ و بـرژانگ وخـاڵ و ئەگریجـەی قیرتـاوی یـار
مـن كـە ئـاواتم بـە واتـە بـردە سـەر بـۆ مـن نـەبوو
سـەر بـەخۆ و تـاوی ژییـانم بـێ بـە ئاسـانی بـەكار
چەشـنی هـۆنراوەی منـە گەوهـەركـەوا پـڕ باییـە
داخـی داخـانم لـە سـەر یـەك لێـدە پرسـی كـوردەوار
چـونكە كـورد نانێنـە بـەر خوێنـدن وە یـا پیـشەوەری
تـا بـزانن لـەم چـەمە كوێیـە كـە ڕێگـەی بـۆ بـووار
كـوردی ئێمـە چـوار بەشـە شـێخ و مـەلاو ئاغـە و گزیـر[1]
هـەر یـەكێكی ئـارەزووی خـۆی بـۆ وڵات دێنێتـە كـار
چـاوێ هـەڵنابڕێ بزانـێ ڕێ لـە كویـۆە كەوتـە دەر
تـا ژییـان تـازە ببینـێ چـۆن ئەچـەرخێ ڕۆژگـار
ڕۆژهـەڵاتی ئێمـە، چـی بـێ دەسـتەڵاتی كـردووە؟
خـۆ پەسـەندی، هـیچ نـەزانین، بـێ سـەرنجی ئیـشوكار
جـووت و گـا، هـەر نـان ئـەزانێ بـۆت بكـا پەیـدا بـرا
ڕاپـەڕێ (نـەوحی) بڵـێ چـی هـەڵفڕێ چـۆن بێتـەخوار

---

١- گزیر: بریكاری ئاغا دێ.

## دڵبەرێکی وا لە دنیا

دڵبەرێکی وا لە دنیا زەحمەتە جارێکی تر
مادەری[1] دەوری زەمانە بێت و بیهێنێتە بەر
وا گلێنەی چاوە سەرسامە! کە نابینێ ئەتۆ
تۆش لە من ناپرسی چۆنی ئەی هەژاری قوڕ بەسەر
عاجزو کوردانە مات و بێکەس و بێ جێگە خۆم
کۆمەڵی عیلم بە تالانی غەمت چوو، بوو هەدەر
لە شکری دووری بە جارێ هاتە نێو نوختەی دڵم
چاوەڕێکەی لوتفی تۆمە مەفرەزەی بێنێتە سەر
خۆشەویستی خوا، لە (نەوحی) بۆچی ناپرسی ئەتۆ
چونکە مەنسووبی خۆتە کەوتۆتە نێو گێژی خەتەر

---

١- مادەر: دایك.

## بەرد ئەتاوێنێتەوە ئاخم

بەرد ئەتاوێنێتەوە ئاخم لە غوربەت بۆ حوزوور
وا بڵێسەی ئاگری دڵ تاوی هێناوە لە دوور
گۆشەگیری غوربەتم، یادت ژیانی ڕۆژمە
شەو ئەسازێنم بە وێنەی تۆ لە ئەشکی[1] دیدە سوور
ئاگری دڵ قرچەیی جەرگ و هەناسەم باوەشێن
مەر، کەبابی تازەبرژێنم بنێرم بۆ حوزوور
وێڵ و سەرگەردانە دڵ بەرژاوی یادی تۆیە خۆ
سازشی[2] نابێ لەوێدا گەرمە جێگەی وەك تەنوور
کارەبای یادت شریتی نیسبەتی هێنایە دڵ
بۆ گڵۆپی ڕۆحی تۆ تەنویری گیانیدا لە دوور
دانەیی خاڵت لە بەر داوی خەیاتەی زوڵفەکەت
ڕائەکێشێ مورغی دڵ ئەو کارەبایە بێ فتوور
گیانی (نەوحی) بیری سۆزەی نیسبەتی شای کردووە
هاتە بیری، پیری ڕێگەی ڕێرەوی ئەهلی حوزوور

---

١- ئەشك: فرمێسك.

٢- سازش: سازشت، ساچان، ڕلزی بوون.

## لازمه بۆ عیلمی عەشقی تۆ

لازمـه بـۆ عیلمـی عەشـقی تـۆ (ریـساڵەی موختەسـەر)[1]
خۆشـە تـەوزیحی بـدا بـۆ ئـەهلی سـەودا موعتەبـەر
کـورتی ئـەرکانی نییـە مـەوزوعی گیـانی عاشـقە
گـەر لـە ئـەحکامی ئەپرسـی هـەر قـەدە بۆتـە فەنـەر[2]
غایـەتی[3] عیللـەی[4] عـەزیزم، مێـژگ ئەخاتـە کەللـەوە
بـا درێـژەی پـێ نـەدەم وێنـەی دوو زوڵفـی موختەسـەر
هـەژدە بـابی غـەم لـە دڵ گـیراوی دووری تۆیـە خـۆ
هـەر بـە نامیلکـەی خـەیاڵی مـن نـەبوو نـەختێ سـەمەر
شـەرحی دیباچـەی جـەماڵی تـۆ قیاسـی بـۆ نییـە
(لـیس ضـوء الـشمس عنـدك نورهـا مثـل القمـر)[5]
مـوو لـە قـەددی تـۆ ئـەکا کەسـبی[6] ئەزاکـەت چـاوەکەم
پیاوی عەشقی تۆ چ دەربەستە لە واتـەی (مـەن) حـەزەر[7]
گـەر دەریـچەی[8] مونفەریجـەی[9] دڵ دەبینـی (نـەوحی) یـا
هـەر وەکـو لافـاوی نووحـە خـوێن و زووخـی دێتـە دەر

---

١– ریسالەی موختەسەر: کورتە نامە، کورتە نامەیەکی بە کەڵك و پوختە، بەمانای ڕوونکردنەوە هاتووە، لە هەمان کاتیشدا ناوی کتێبێکە کە فەقێکان دەیخوێنن.

٢– فەنەر: فانۆس، چرای دەستی.

٣– غایەت: مەبەست.

٤– عیللە: عیللەت، دەرد، نەخۆشی.

٥– ئەم خشتە بە عەرەبی داڕێژراوە کە واتاکەی بریتییە لە (ڕۆژ ڕووناهی تۆی نییە و تۆیش لە مانگ دەچی).

٦– کەسب: بە دەستهێنان.

٧– مەن حەزەر: لە (من حضر)ی عەرەبییەوە هاتووە.

٨– دەریچە: دەربیچە، کڵاوڕۆژنە، ڕۆچنە، کونی ماڵ بۆ ڕۆشنایی.

٩– مونفەریجە: کراوە، ئازاد.

## دەنگی شمشاڵە کە بۆیە

دەنگی شمشاڵە کە بۆیە مەجلیسی هێنایە فەڕ[1]
دەست و بردیٚ چاوەکەم ساقی لە پەردە بێنە دەر
بەزمی (ئەی شل)[2] نەزمی (ئیجباری)[3] بە گۆرانی بڵێ
خۆشەویستی من لە هەوری ڕۆژی ڕووی هێنایە دەر
ناحەزم دوورە لە باغی حەزرەتی یارم شەویٚ
ئەرکی[4] کێشا بە دەستی خۆی کە چاوی هێنایە سەر
یاری وا منداڵ و ژیر و بە تەمیز و مەستە چاو
گەر بە تەقلیدیش دروستە ئارەزووم خۆ وا لە سەر
بیم وە ئەو فەتوادەرەی[5] حاڵی نەبووی ناخوێندەوار
ڕووی سپی وەك مووی حەبیبە ڕەش بکەم ئەمجا بە دەر
بۆیە ناوێرم لە شیشە باندەمی لیٚ لابدەم
نەك نە یارو پاپی ئەعزەم[6] بێنە دەرگا و بێنە ژوور
عیلم و شەرعی نایە تاقی دوو برۆی خوێن ڕێژی تۆ
تازە (نەوحی) دەرسی عەشقی خوێندووە ئەیکا لە بەر

١- فەڕ: بەهرە، سوود، کەڵك.
٢- بەزمی ئەی شل: سەربەندی گۆرانیەکی فۆلکلۆری کوردییە.
٣- ئیجباری: سەپاندن، زۆر لێکردن.
٤- لە زۆربەی دەستخەتەکاندا نووسراوە (زەحمەتی).
٥- فەتوادەر، موفتی، ئەو زانا ئاینییەیە کە سەرچاوەیە بۆ ئاین و مافی فەتوادانی هەیە.
٦- پاپی ئەعزەم: سەرۆکی ڕۆحانی پێڕەوانی مەزهەبی کاتولیك.

## نەیاری تۆ سەگێکە

نەیاری[١] تۆ سەگێکە بەشکو بیریکەی لەوەش کەمتر
ئەگەر هاتو بیژمێری دووسەد و بیستە ئەبێتە کەر[٢]
دڵم بۆ تۆ، سەریشم وا لە مەیدانی سیاسەت بوو
بەراتی ماچی لێوی تۆیە وەکو گۆ[٣] بۆ شەقێنکەر[٤]
لە بەحری عەشقی تۆ، تابووری غەمزەت دێنە نێو پاپۆڕ
لە کەشتی مەینەتا بێ سوودە ئەگەر دابخەم لەنگەر
لە سەر ئەو تەختە پارە[٥] دائەنیشم تا بزانم چۆن؟
نەجاتم بێ لە گێژی مریەم و[٦] بۆ خۆم بڕۆم بۆ دەر
جەهەننەم بێ بەیادی تۆ، بەهەشتە بۆ دڵی (نەوحی)
ئەگەرچی داخرا قوفڵی دڵم لەم دەشتە بێ شەشدەر

---

١- نەیار: ناحەز، نانۆست.

٢- کەر: بە ئەبجەد دەکاتە (٢٢٠) بە مەرجێ لە سەر ڕێنووسی کۆن بنووسرێت (کر)، ك= ٢٠ + ر= ٢٠٠.

٣- گۆ: تۆپێکی خڕە لە داری بتەو ئامادە کراوە بۆ یاری شەقێن، یارییەکی فۆلکلۆری ڕەسەنی کوردەوارییە.

٤- شەقێن: یارییەکی فۆلکلۆری کۆنی کوردییە، بە هۆی گۆ و داردەستەوە لە نێوان دوو تیپدا وەك یاری تۆپی پێ ئەنجام دەدرێت، ئەوەی لەو یارییەدا بەشدار بێت، پێی دەڵێن (شەقێنکەر).

٥- پارە: پارچە، لەت، کوت.

٦- گێژی مریەم: مەبەست لە ڕووداوەکەی حەزرەتی مریەمە کاتێ (عیسا) پێغەمبەر کەوتە سکیەوە.

## نەخۆشی دووری ئەوم[1]

نەخۆشی دووری ئـەوم و مـن کـە بـرینم هـیچ نییـە زاهـیر[2]
بـە خـوێنم چـۆن ئـەدا فـەتوا جـەنابی (مـوفتی) یـە زاهـیر
تـەرازووی عەشـقم ئـەمڕۆ کـە لەگـەڵ عـەقڵم نییـە میـزان
کە وابوو هیچ موکەللەف[3] نیم بەشەرعی ئەحمـەدی تـاهیر[4]
بە سورخی دیدە ئەمنووسی حەواشـی[5] خـەتتی ڕەیحانـت[6]
لە مەشقی ڕەمزی غـەمزەی تـۆ، بـە منـداڵی بـووم مـاهیر[7]
برینـی دڵ نیهـان بـوو لـێم هەتاکـەی لێـی گـەڕێم، چـاوم
کـە ناچـارم بـە بـێ پـەروا بـە فرمێـسکی ئەکـەم زاهـیر
مـەدەن تانـە[8]، مەکـەن لۆمـە، مـەبن بـاعیس[9] بـە گریـانم
لـە ئـەوەڵ مەزهـەبی ئێمـە بـە خـوێنی دڵ بـووە زاهـیر
لـە کـاتی حـەزرەتی عەشـقی لـە نێـو دڵ چـادری هەڵـدا
بڵاوەی کرد بـەبیرو هـۆش و دەرك[10] و حاسـسەیی[11] زاهـیر
هیچ پەندێ ناگرێتە گـوێ کـە دڵـی پـڕ بـێ لـە دەردی یـار
وەکو (نـەوحی) ئـیتر مـەنعی مەکـە ئـەی زاهیـدی[12] زاهـیر

١- لە پێشەکی شیعرەکەدا، ئەم ڕستەیەی تۆمارکردووە (ئەم هۆنراوانە خاوەن زەوقن، نەزم و هەواکەیان ئەدۆزێتەوە).
٢- زاهیر: ئاشکرا.
٣- موکەللەف: پێسپێرلو، بەرپرسیار.
٤- ئەحمەدی تاهیر: ئەحمەدی خاوێن: مەبەست لە محەممەد پێغەمبەرە (د.خ).
٥- حەواشی: کۆی (حاشیە): پەراوێز.
٦- خەتتی ڕەیحان: جۆرێکە لە خەتی خۆشنووسی.
٧- ماهیر: شارەزا.
٨- تانە: سەرزەنشت.
٩- باعیس: هۆ.
١٠- دەرك: تێگەیشتن.
١١- حاسسە: هەست.
١٢- زاهید: سۆفی، دەروێش، خواناس.

## ڤیری وێم[١]

ڤیرو[٢] هۆشی وێم[٣]، دایم[٤] ها چە[٥] لاش[٦]
لای ماچی لێوش[٧] هەرزان بی چە لاش
کۆمەڵێ ناحەز واتن[٨] زەرەرەن[٩]
واتم[١٠] کەم بییەن[١١] چەی وێنە بەلاش
مەر[١٢] نمەزانی چە قیامەت ڕا[١٣]
لاشەفا کەردە مەقبووڵم چە لاش
سەر بەخۆ و سەر بەست دڵا زارەنی[١٤]
مەوانی سوورەی (مین خەوفین)[١٥] چە لاش
ئوسووڵێ شیرین چەلای تۆ هەنەن[١٦]
(جمع الجوامع)[١٧] فیرعەون ها چە لاش
چە نوای وەسڵی وێش[١٨] کجی[١٩] ژەنانە[٢٠]
بڕیان وە باڵام دوور بۆ چە باڵاش
باچە[٢١] بە کوردی تەلقینی (نەوحی)
بوانۆ[٢٢] مەلا گەر هەنەن چە لاش

---

١– نەوحی ئەم شیعرەی بە شێوەزاری ماچۆ (گۆران) وتووە، کە ئەم هۆزانە لە ناوچەی گەرمیاندا بەم دیالێکتە دەدوێن (کاکەیی، زەنگنە، باجەلانی، جمبوور، شێخانی، ڕۆژبەیانی) هەروەها شەبەك و کاکەییەکانی شارۆچکەکانی (قەرەقوش، نەمرود، بەرتەڵە، باشیك، تلکێف) و گوندەکانی دەوروبەریان کە بە (٣٠) کیلۆمەتر دەکەونە خۆرهەڵاتی شاری (مووسڵ)ەوە. ٢– ڤیر: بیر. ٣– وێم: خۆم. ٤– دایم: هەمیشە. ٥ – چە: جە، لە، ژە.

٦– لاش: لای، ئەم نیوباڵە لە هەندێ دەستخەتەکانی شاعیردا بەم جۆرە هاتووە (ڤیری وێم ڕۆحم کیانا چەلاش)، یان (ڤیری وێم گیانمی کیانا نە لاش) کە لەنگییان تێدایە.

٧– لێوش: لێوی. ٨– واتن: وتیان. ٩– زەرەرەن: زەرەرمەندە. ١٠ – واتم: وتم. ١١ –بییەن: بووە.

١٢– مەر: مەگەر.

١٣– ڕا: ئەمە زۆرجار لە فارسیدا وەك پاشبەند لەگەڵ هەندێ وشەدا بە کار دێت.

١٤– دڵا زارەنی: دڵ پەرێشان.

١٥– سوورەی مین خەوفین: دەستنیشانە بۆ سوورەتی قورەیش ئایەتی ٤.

١٦– هەنەن: هەیە.

١٧– جمع الجوامع: کۆکردنەوەی حەشاماتێکی زۆر، ئاماژەیە بۆ لەشکرە بەر فراوانەکەی فیرعەون.

١٨– وێش: خۆی. ١٩– کجی: کراس. ٢٠– ژەنانە: ژنانە، ئافرەتانە ٢١ – باچە: بڵێ.

٢٢– بوانۆ: بخوێنێت، واتە: کاتێ کە مردم، بە مەلا بڵێن: ئەگەر بۆی دەکرێت، با تەلقینم بە کوردی بۆ بخوێنێت.

## جوانی قەڵەمی بێ ئەلەمی

جوانی قەڵەمی بێ ئەلەمی پیشەیی خەللاق
ئەو خاڵ و خەت و زوڵف و لەگەڵ جووتێ برۆ و تاق
مەیدانی تەفەککور نییە بێ شوبهە و و وێنەی
مانی[1] نییەتی نوسخەیی ئەو ڕووتە بە مەششاق
سەرو و سەمەن و شەسپەڕو گوڵباغ و وەنەوشە
بێ قەدرە لە لای دیتنی تۆ و دیدەیی عوششاق
ئەو مەدرەسە بێ باسە لە تۆ دیتنی کوفرە
مزگەوت و کلیسایە لە بۆ سوننەتی ئیشراق[2]
ڕووت ڕوومیی و[3]، خاڵت حەبەش و[4]، زوڵفتە زەنگی[5]
تالانی ئەکەن دین و دڵی عاقڵ و موشتاق
مەی بێنە بەخێری لەبی لەعلی شەککەرینی
ئەرێ هۆ ساقی چاو بادە گرە و بردە لە ئافاق[6]
دەستت لە خەنەی گرتووە یا نەخشی خوایە؟
یا خوێنی دڵی (نەوحی) یە مەشهوورە لە عوششاق

---

١– مانی (٢١٦–٢٧٧ز): کوڕی پورتەگ کوڕی بابك بووە، ناوی دایکی مەریەم بووە و لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەردەوانی شاهنشای ئەشکانی لە دایك بووە، وێنەکێشێکی بلیمەت و زانا و دانایەکی گەورە و بێ هاوتا بووە. ئاشنایەتی لەگەڵ پزیشکی ڕوحانیدا هەبووە و دواوای پێغەمبەرایەتی کردووە. بیروڕاکانی لە کتێبی ئەرژەنگدا تۆمارکردووە. لە بەر بیری ئازاد و سەربەخۆ، خراوەتە زیندانەوە. لە دوای ئازاردانێکی زۆر و لە پاش بیست و شەش ڕۆژ، کۆچی دوایی کرد. لە دوای مردنی، سەریان بڕیوە و پێستیان کەندووە و کایان تێکردووە و لە دەروازەی شاری جندی شاپووردا هەڵیان واسیوە. تا دەوروبەری ئیسلامیش دەروازەکە بە ناوی ئەم زاتەوە بوو.

٢– سوننەتی ئیشراق: لە پاش دەرچوونی ڕۆژ، دوو ڕکعات نوێژ دەکرێت و پێی دەڵێن (سنة الاشراق).

٣– ڕووم: ڕۆم.

٤– حەبەش: تایفەیە پێست ڕەشن لە ئەفریقا.

٥– زەنگی: زەنگ، ناوی تایفەیەکی پێست ڕەشن لە وڵاتی ئەفریقا.

٦– ئافاق: بەهۆش هاتن، بێدار بوون.

## کورتی هێنا تیری برژانگی

کورتی هێنا تیری برژانگی لەبۆ نیشانی دڵ
دای لە بەندی جەرگ و، یانی، تۆ مەیە نێو باغی گوڵ
زامی دڵ وێنەی نیشانەی خاڵی ڕووی زیبایە[1] خۆ
ڕیزی پێکاوە لە جەرگم بۆیە وا زوو دێتە کوڵ
داخی دووری و ئێشی غوربەت خۆشەوە نابێ کەچی
تازە واتەی ناحەزم وێنەی برینی تیغی کوڵ
گەردشی[2] گەردوون نە یاری تێگەیشتوو بوو لە زوو
من بەیاری ناگرم ئەو تاڵە ژارەی ناوی گوڵ
پێی بڵێ خزمینە (نەوحی) خۆی کوتایە دڕك و داڵ
غونچە سەد خەندە بکا نایەتەوە نێو باغی گوڵ

---

١- زیبا: ئارایشت، جوان، چاك.
٢- گەردش: ئاژاوە، پشێوی.

## چاوەکەم زانیوتە بەندە

چـــاوەکەم زانیوتـــە بەنـــدە عەبـــد و خزمـــەتکارتم
مەسـت و بـێ بـاك و دەبـەنگی[1] دیـدەیی خوومـارتم
بۆیـە قـارت گرتـووە ئەمخەیتـە بـەر بـاری مـەراق
مـــن موســـڵمانی مـــژانی[2] دوو چـــەمی[3] غـــەددارتم
دڵ کـەوا هێـزی نـەماوە چـاو کـەژەڵ[4] واوە وەرە
چـــونکە بیمـــارو زەعیفـــی چـــاوەکەی بیمـــارتم
غەمزەیی چاوت حـەکیم و[5] سـەر پزیـشکی خەستەیە
مـــن برینـــداری کـــەوانی دوو بـــرۆی کوففـــارتم
دەك خەجاڵەت بی لـە مـن ناپرسـی دوێنـێ کوشـتمت
خـۆ دەمێکـە بولبـولی خۆشـخوێنی نێـو گـوڵزارتم
ســـوورەتم گـــۆڕا بـــە تەجریـــدی[6] هـــەیوولا هـــاتووم
کـــێ هەیـــە مـــەنعم بکـــا دڵ ئـــارەزووی دیـــدارتم
دێمـە مەیخانـە بـە فـەتوای حـەزرەتی پـیری مۆغـان
بەنـــدە[7] وەك (نـــەوحی) هەمیـــشە تـــاڵبی زوننـــارتم[8]

---

١- دەبەنگ: حۆل، گێل، نەفام.
٢- مژان: کۆی (مژە)یە، برژانگ.
٣- چەم: چاو.
٤- چاو کەژەڵ: چاوکەژاڵ، چاوکاڵ.
٥- حەکیم: پزیشك.
٦- تەجرید: ڕووتانەوە، لێکردنەوە.
٧- بەندە: بەنە، کۆیلە.
٨- زوننار: زیننار، پشتێن.

## کەوتم لە بەری پێیێ

کەوتم لە بەری پێیێ و وتی چا بوو نەهاتم
پێم وت چییە ئەمرت هەیە ئەمڕۆ بەمەماتم؟
فەرمووی بە دەمی خونچە تەڕو ناسك و نەرمی
عاجز مەبە بۆ دەردی ئەتۆ نێستە شیفاتم
پڕ دوڕ و گەوهەر بوو حەوش حەرەم و حەساری[1]
دوو سێوی لە سنجانی[2] وەها کردە خەڵاتم
تەبعم لە غەما تاڵە وەکو زەهری هەلاهیل[3]
پڕ شەکرە لەبم تازە چ پێویستی نەباتم[4]
سندووقی سەرتبم[5] لە دڵم چاری خەتەرکە
تا نەمکوژی نازانی کە (نەوحی) بە وەفاتم

---

١– حەسار: دیوار، پەرژین، دیواری قەڵا، کۆمەڵە خانوویەك کە دیوارێکی گەورە و بەرز دەوری دابێت، یان بێستانێك کە حەسارێکی لەو جۆرەی بۆ ئامادە کرابێت.
٢– سنجانی: مەبەست لە بەریاخە و سینگە.
٣– هەلاهیل: هەلاهەل: شیلەی گیایەکە زۆر کوشندەیە.
٤– نەبات: جۆرە شەکرێکی مینارەنگە.
٥– سندوقی سەر: واتە: خۆمت بۆ دەکەم بە قەڵغان.

## گیراوی داوی خاوی

گیراوی داوی خاوی[1] دوو زوڵفی مەستە چاوم
سووتاوی تاوی ناری، مەمانی شلك و خاوم
بەعەتری مەست و بێ هۆش، بە چەتری زوڵفی ماتم
برژانگی تیرە بۆ من لە خاڵی بەش بڕاوم
لە دەوری خەتتی لێوی پڕ خاڵی پڕ خەیاڵم
گیراوی لێوی ئاڵ و شیرین و شەکری خاوم
کوژراوی لە نجەو لاری کاتێ دەچێتە کانی
بە تاڵی زوڵفی ئەمڕۆ بە وێنەی بەندی داوم
لە حەو سەعاتی شەودا کە ڕۆژ گیراوە (نەوحی)
دەلیلی وەسڵە تاڵی نەماوە بۆ حەلاوم[2]

---

١- داوی خاوی: ئاماژەیە بۆ زوڵفی ئازیزەکەی.

٢- حەلاو (حەلاوە): شیرینی.

## چاوەکەم تۆ خۆت ئەزانی

چاوەکەم تۆ خۆت ئەزانی من لە سەرکام مەزهەبم
شێتی ڕوخساری ئەتۆم و خاوەنی دوو مەنسەبم
سوژدە بەر میحرابی ئەبرۆی تۆم و بەندەی خاڵتم
مووچە خۆری ماچی لێوی یارەکەی بێ مەزهەبم
من گرفتاری کەمەندی زوڵفی تۆم و شافعیم
حەزرەتی خاڵی لەبی خۆتە کەفافی مەشرەبم
حەیفە گەنجینەی خەیاڵت کونجی دڵ چۆڵی ئەکەی
بۆ گرانی باری کووردە جەرگ ئەڵێ: من مەرکەبم
هۆشم داناوە لە بارمتەی سەرۆکی سەربەخۆ[1]
هەر وەکو (نەوحی) کە سەر بەرزو ڕەواجی مەزهەبم

---

١– ئەم دێڕە بە ئەم شێوەش هاتووە (بۆ گرانی باری دووریی ڕۆح دەڵێت: من مەرکەبم هۆشم داناوە لە بارمتەی دوو لێوی ناسکی).

## به فریادمگه ئه‌ی یار

به فریادمگه[1] ئه‌ی یاری حه‌یادارو وه‌فا ناسم
به‌گیانی تۆ قه‌سه‌م غه‌یری ئه‌تۆ یارێ که ناناسم
به‌پیری[2] پیره‌وه ڕۆیم له گێژی بیریا داچووم
به هیوا تێکه‌ڵم شاسواری مه‌یدان بۆچی ناناسم
که یارم شا تورنجه[3] مه‌م ڕۆخی[4] فه‌رزه له لای ئێمه
به‌سواری فیل[5] نه‌یاری مات[6] ئه‌که‌م من پیاده ناناسم
چه‌می غه‌م خۆ بووار نادا منیش له‌م به‌ر که داماوم
له گه‌ڵ جێماو و پێی ناگه‌م له‌گه‌شتی گشتی بێ باسم
هه‌وای سه‌ر خاڵی لێوی ئه‌و دڵی گرتم به‌شیرینی
ئه‌ڵێی بیناوه[7] بردوومی بۆیه وا که‌لله‌یی[8] و کاسم[9]
فه‌نه‌ر قه‌فقه‌ف[10] له‌سه‌ر یه‌ك بێ به هێزی مۆمه ڕووناکی
که پۆلی ئیمه بێ مۆمه به‌چی بێ قه‌د قه‌فی ڕاسم
به‌لاری تێ ئه‌گا ڕاسی که یاری پێ ئه‌کا باسی
له (نه‌وحی) بۆچی ناپرسێ ئه‌ڵێ ئه‌و کورده نایناسم

---

١– به‌فریادمگه: به فریام که‌وه.
٢– به‌پیری: پێشوازی لێکردن.
٣– شاتورنجه: نارنج، نارنجی زۆر چاك و نایاب، میوه‌یه‌که له تیره‌ی پرته‌قاڵ و لاله‌نگی.
٤– ڕوخ: ڕوخی شه‌تره‌نج.
٥– فیل: فیلی شه‌تره‌نج.
٦– مات: ماتی شه‌تره‌نج.
٧– بیناو: گێژاوی ئاو، خولاندنه‌وه.
٨– که‌لله‌یی: تووڕه.
٩– کاس: گێژووێژ.
١٠– قه‌فقه‌ف: چین چین.

## پرشەی سەری کوڵمی[١]

پرشەی سەری کوڵمی کە لە دڵ داوە ئەجۆشم
سووتاندی دڵ و جەرگی بڕیم ئێشی نەخۆشم
خۆم بێکەس و بێ جێگەو بێ خزم وەبەس خۆم
بازاڕی سەرو ماڵمە ڕۆح و ژینم ئەفرۆشم
لە تاوی غەمی دووری و هەتاوی سەری گۆنات
هاوڕازی دڵ و جەرگی منە بۆیە پەرۆشم
ناڵەی شەوو ئاخی دڵ و هاژەی چەمی فرمێسک
ئەڵێ: کرمانجم وەڕس کرد، بۆ گۆران ئەخرۆشم
تاوی ئێش و غەمی دووری و نەخۆشی لەگەڵ یەك
هامڕازی نەیارن کە منیش یاری نەخۆشم
یاسینی ئەمن خۆینە لە جەرگم خوێن کە بە قوڵ دێ
بەم شینە لە ئەم نیشتنە، لێم بوو بە دڕۆشم
بێکەس هەرمنم و بێکەسە یەزدانی هەموو کەس
سووتاوە لە غەم (نەوحی) کەوا شینە ئەپۆشم

---

١- ئەم شیعرە بە چەند جۆرێك داڕێژراوە، بەڵام ئێمە ئەمەیانمان پەسەند کرد.

## باغی دڵ سووره له داخی

باغی دڵ سووره له داخی خاڵی ڕووت خۆم شین ئەکەم
دوور لە میحرابی بڕۆی تۆ سوژدەگاهی دین ئەکەم
دڵ وەکو کۆتەی قەساب[1] و چاو وەکو جۆگەی دەلێن
وام لە مەیدانی مەراق و ئەسپی غەم وا زین ئەکەم
دوور لە خەتتی لێوی ئاڵ و ڕەمزی غەمزەی چاوەکەت
بەندە هۆشی لا نەماوە تازە کوێرە زەینەکەم
تاکو دوێنێ لوتفی تۆ بوو من کە خۆم پێگرتبوو
زەحمەتە تازە لە دووریت باقیمان[2] و ژینەکەم
تۆ وەرە دەرمانی دەردەکەم کەو باکت نەبێ
شارەزا نابێ نەیاری سەگ، بەکەین و بەینەکەم
چاو هەڵێنە بۆ منی کوژراوی تیری چاوەکەت
ئەو ئیشارەی تۆ شیفایە بۆ برینی سینەکەم
چونکە تۆ سەرمەزهەبی (نەوحی)، تۆ مەحبووبەی ئەوی
با فیدای تۆ بێ دڵ و ڕۆح و سەرو هەم دینەکەم

---

١- کۆتەی قەساب: بریتییە لە دارێك کە قەساو گۆشتی لە بان ورد دەکات.

٢- باقیمان (باقی): هەمیشەیی. نەوحی لە پێشەکی شیعرەکەیدا نووسیویەتی (بیدۆزەرەوە گۆرانییە)، بەڵێ، ئێمەیش دەڵێین گۆرانیبێژی ناسراوی کورد خوالێخۆشبوو (حوسێن عەلی ١٩٢٥–١٩٩١)ن کردویە بەگۆرانی. (مامۆستا محەممەد عەبدولڕەحمان زەنگنە)ی نووسەر ڕۆژێك پێی وتبن (خوالێخۆشبوو حوسێن عەلی بۆی گێڕامەوە کە: ڕۆژێك بە ڕێکەوت لە ناو ئۆتۆمبیلدا لە نێوانی خورماتوو و قادرکەرەم لەگەڵ مەلا حەسەنی نەوحیدا پێکەوە سوار بووین و لە ڕێگادا یەکمان ناسیی و ئەو پارچە شیعرەی پێشکەش کردم، منیش کردم بە گۆرانی).

## من کە بێزارم

من کە بێزارم لە ژینی خۆم بە دڵ زاری ئەکەم
من بەهەشتم بۆچییە گەر ماچی نیۆ زاری نەکەم
لاشەکەم لێرایە[1] گیانم وا لەبەر پێی تۆ لەوێ
لێو بە خەندەی بۆ[2] نەیارم دەردی بێکاری ئەکەم
شارەزا بووم و لە ئایین ڕێگەکەم لێ ون بووە
دڵ لە شوێنی خۆی نەماوە تووشی ئازاری ئەکەم
شەمسییەی[3] ڕوخساری تۆیە مایەی[4] تەهزیبی[5] دڵ
حیکمەتی قازی لە خاڵی حاشییەی لاری ئەکەم
جەوهەری جووتێ برۆ سەتحی دڵم تەحدیب[6] ئەکا
کەم نەبێ باغی جەماڵت کەیفی گوڵزاری ئەکەم
قەت عەقیدەم پێ نەبوو جەوهەر کە فەردێکی هەیە
تا بە خەندە هاتەوە لام ئێستە ئیقراری ئەکەم
پێم ئەڵێن (نەوحی) لە بەرچی لێو بەباری دائیما
داخی دووری و ئێشی دڵمە بۆیە ئیزهاری ئەکەم

---

١- لێرا: لێرە، ئێرە.
٢- لە دوو دەستخەتدا نووسراوە: نێو.
٣- شەمسییە: چەتر.
٤- مایە: هۆ.
٥- تەهزیب: بژارکاری، چاککردن.
٦- تەحدیب: قۆقزکردن.

## گەر لە حاڵی من ئەپرسی

گــەر لــە حــاڵی مــن ئەپرســی دڵ کــە پــاراوی غــەمم؟
وام لە غوربەت موتتەسیل[1] مەبهووت و[2] بێ کەیف و کەمم
گەرچی خـۆ مـانگی گوڵانـە ڕووم وەکـو بـەرگی خـەزان
زەردە چــاوم ســووره بـــەرگم شــینە دڵ پــڕ ماتـــەمم
زوڵفەکـــەت وا خـــاوو لوولـــە شـــیعرەکەم ئـــاڵۆز ئـــەکا
کـــاتی نووســـین هـــارو هـــاجم پاتـــشام و بـــێ خـــەمم
مـاڵی دنیـام هەرچی بـوو هاوێـشتمە سـەر خەزنـەی دڵـم
گەوهـــەری فرمێـــسکی چـاوم بـوو بـــە وێنـــەی حاتـــەمم[3]
مـــن ئەســـازێنم لـــە کـــونجی غـــەم بەشـــەرتی وێنەکـــەت
گـەر چـی دووریـشم لـە خزمـەت خـۆ لـە غوربـەت خـادمم
مـن سوپاسـی تـۆ ئـەخوێنم ڕوو لـە هـەر کوێیـە بکـەم
بـــا وجـــوودی ئـــەم هـــەموو دەردە ئـــەکا عالـــەم زەمـــم
گـــەر ببـــێ چـــاوت لـــەمن بـــێ تـــەپڵی شـــایی لێ ئـــەدەم
هـەر وەکـو (نـەوحی) ئەگـەر خـۆ دەم بنێتـە نـاو دەمـم

---

١- موتتەسیل: چەسپاندن، لکاندن.

٢- مەبهووت: سەرگەردان.

٣- حاتەم: حاتەمی تەی.

## نەچیری نازی بازی

نەچیری نازی بازی دوو چاوی شۆخ و شەنگم
گیراوی داوی خاوی دوو زوڵفی وەك فەرەنگم
بەیانی ڕۆژ ئەبینم کە ڕۆژ بە ڕووت ئەبینم
لە تاو هەتاوی ڕووتە زەعیف و زەردە ڕەنگم
هیلالە جووتێ ئەبرۆ چرایە کوڵمی یاخۆ
دوو باغی پڕ لە زاغە دوو کوڵمی دیدە شەنگم
بیماری گازی مارم خوماری چاو بیمارم
هیلاکی دەستی دێوی[1] نە یاری وەك پوڵەنگم
گەر خەڵکی شاری یاری سەبا[2] وەرە لە لای من
نامە ببە لە بۆ ئەو تا ئەو نەخەیتە چنگم
بە بارە لێوی (نەوحی) لە داخی خاڵی لێوت
بە تیری چاوی تۆیە دڵ کونکونی خەدەنگم

---

١– دێو: دەعبایەکی زەبەلاحی ترسناکی خەیاڵییە. لە چیرۆك و حیکایەتە فۆلکلۆرییەکاندا، ناوی زۆر هاتووە.
٢– سەبا: بای بەرەبەیانی فێنك.

## ئەم دەورە مەحاڵە

ئــــەم دەورە مەحاڵـــە کـــە بکـــا چـــاری بـــــرینم
عالــەم موتەسەلــسیل[1] بــە تـــەمای تـــۆیی ئــەبینم
تـــەتبیقی خــــەیاڵی هــەموو بـــۆ حـــەددی موســـابم[2]
فــەرقی وەکــو شـــەمس و قەمـــەری ڕووتـــی ئــەبینم
خرخـــاڵی[3] ئــەتۆ خوســــرەوی[4] ســـەییارەیە ئــەمڕۆ
یووســـف لـــە حوســـنتا بـــە ســـەنا جـــووتی ئــەبینم
گـولْ بـۆنی نـەما ڕۆیـی بـە تیـشکی سـەری ڕووی تـۆ
تـــا ڕۆژی جـــەزا جـــەزبی وەفـــا بـــۆتی ئـــەبینم
مــەززەی غــەمی دونیــا بکــە نێــو پیاڵەیــە پــڕ مــەی
بـۆ (نــەوحی) کــە ڕۆحــی لــە جــەفای تۆیــە ئــەبینم

---

١- موتەسەلسیل: بەزنجیرە، یەك لە دوای یەك.

٢- موساب: بە ئامانج گەیشتن.

٣- خرخاڵ: بازنەی قۆڵ لە زیو و زێڕ ئامادەکراو، پاوانەی پێ لە زیو و زێڕ، جۆرێکە لە خشڵی ژنان.

٤- خوسرەو: خوسرەوی پەروێز.

## یاران گوڵەکەم عاجزە

یاران گوڵەکەم عاجزە ئەمڕۆکە لە دەستان
تۆراوە لە بەر باغ و لەنێو غونجەیی بوستان
مەیهاوە لەبۆ جەرگی ئەمن تیری مژەی خۆت
مەی بێنە ئەڵێن جەژنە لەبۆ بادە پەرستان
پەنجەت کە خەناوی[1] بووە خوێناوی دڵم بوو
یا عەکسی شەرابێکە، لە ناو بادەیی دەستان
چاوم کە گلی[2] کردووە چاوم گلەییت کرد
مەیلت کە وەها ساردە وەکو ساردیی زستان
گوڵزاری ئیرەم[3] وێنەیی ڕووی تۆیە عەزیزم
مەقسەد[4] بە دڵی (نەوحی)یە نایدەم بە گوڵستان

١– خەناوی: ڕەنگ وەك خەنە، ڕەنگی خەنەیی کە سوورە. (خەنە) لە بواری بازرگانیدا دەفرۆشرێت، ژنان دەست و پێ و سەریان پێ ڕەنگ دەکەن.
٢– گل: ئازاری چاو.
٣– ئیرەم: ئەو باخچە و گوڵزارەیە کە شەدداد کوڕی عاد بەناوی بەهەشتەوە دروستی کرد.
٤– لە دەستخەتێکدا نووسراوە (مەبەست) و لەسێ دەستخەتی تردا بە (مەقسەد) هاتووە.

## شەکلی بادامییە چاوو برۆی

شەکلی بادامییە دوو چاوو برۆی تیرو کەوان
بۆ هەموو کوردە هەتا دێتە جزیرە و بۆتان[1]
قامەتی ئێمە لە بەر چاوی ئەوان بۆچ چەما[2]؟
راستە ئەم چەوتییە بۆ تۆ کەوتۆتە نێو گۆران
ئەم ئەڵێ چونکە ئەمن نیمە ئەویش با نەبێ
ئەمەتا مایەی تێکچوونی بناغەی هەموو کوردان
پۆلی کوردان و گەلی کورد و هەموو گۆرانیش
چونکە تەرکی یەك ئەخەن وەختە ببن سەرگەردان
ئەوەی پێویستە لەبۆ هاتنە دەستی دڵخواز
یەکیەتی بوو تۆ بڵێ (نەوحی) بە حەققی قورئان

١– جزیرە و بۆتان: دوو ناوچەن دەکەونە باکووری کوردستان کە زووتر میرنشین بووە.
٢– چەما: چەمایەوە، خواربوو، چەوت بوو، لار بوو.

## دەستم گەیشتە سینە

دەستم گەیشتە سینە بەشەرتی ڕاو و پەیمان
دوو بەی دەگووشێ زیاتر حەددی نییە بە ویژدان
وتی دە لاچۆ دیسان من تۆ چلۆن ئەناسم
دەستت گەیشتە سینەم ماچم ئەکەی لەپێشان
وتم: بەچاوی مەست و ڕەیحانەیی دوو زوڵفت
دڵ داغی خاڵی ڕووتە وەك داغی گوڵ لە گوڵدان
زەکاتی زیوی گەردن چل یەك حەڵاڵە بۆ من
قیاس ئەکەم لە ماچی ژێر چینی زوڵفی قەتران[1]
ئەی باغەبان بە ساقی بڵێ لە نیوە شەودا
مەززەی[2] شەرابی جەرگی (نەوحی) بکاتە فنجان

---

١– قەتران: ڕەشی تۆخ.
٢– مەززە: خواردنێ کە لەگەڵ شەراب بخورێت.

## چە ڕاگەی ویساڵ[1]

چە ڕاگەی[2] ویساڵ[3] منش وێڵ کەردەن[4]
توو واسا[5] ماچی[6] تەجرەبەش[7] کەردەن
ماچی دیدە باز[8] ئانە[9] ناحەزەن
کۆکەنش[10] کوشتەن وەنەش ڕێ بەردەن[11]
مەجنوون[12] چەنی[13] من فەرقشان فرەن
شایەتم لەیلێن تەجرەبەش کەردەن
بەختم بە وێنەی ڕووی ناحەز بە دین
سیان چەنی مووی پەرچەم چە گەردەن
ئەگریجەش دڵم گەستەن چەنی جەرگ
چەوساوە[14] زوخاو[15] چەنەش[16] ڕێ کەردەن
چە گەرمی دڵ و سەردی مەیلی تۆن
بە وێنەی حەدیس[17] ئەللفم[18] کەردەن
(نەوحی)یەن مێڵۆ[19] چە[20] هەردەی مەراق
هەر کاتێ زانای چەی ڕاگە مەردەن[21]

---

١- ویساڵ: ئەم چامە شیعرە بە شێوەزاری (گۆران)ـە کە لە دەڤەری گەرمیاندا پێی دەڵێن (ماچۆ).
٢- ڕاگە: ڕێگە.
٣- ویساڵ: پێوەندی، بەیەکگەیشتن.
٤- کەردەن: کردویەتی.
٥- واسا: بەو جۆرە. واسا ماچی: وا دەڵێی.
٦- ماچی: دەڵێی.
٧- تەجرەبە: تاقیکردنەوە، ئەزموون.
٨- دیدەباز: چاوباز.
٩- ئانە: ئەوە.
١٠- کۆکەن: فەرهادی کۆکەن، لە سەردەمی خوسرەوی پەروێزدا ژیاوە، دڵدارەکەی شیرینی ئەرمەنە.
١١- بەردەن: بردویەتی.
١٢- مەجنوون: قەیسی عامیری، خەڵکی نەجد بووە، عاشقی لەیلای عامری بووە، بە مجنوون و مەجنوون لەیلا ناسراوە.
١٣- چەنی: لەگەڵ.
١٤- چەوساوە: لەوساوە.
١٥- زوخاو: کێم و خوێنی برین و زام و دومەڵ.
١٦- چەنەش: لێی.
١٧- حەدیس: وتە، قسە، باس.
١٨- ئەللف: دلنان.
١٩- مێڵۆ: دەگەڕێت، دەسووڕێتەوە.
٢٠- چە: لە.
٢١- مەردەن: مردووە.

## خەڵکی عالەم پاکی ئەمڕۆ

خەڵکی عالەم پاکی ئەمڕۆ بێن و تەکفیرم بکەن
یا حەواڵەی غەیبەت و بوختان و تەزویرم بکەن
خاکی بەر پێی تۆم و تا ڕۆژی جەزا مەمنوونتم
با مەلا و شێخ و عەوامیش بێن و تەنفیرم[1] بکەن
چاوی نەرمی تۆیە مایەی ژینی زات و سوورەتم[2]
مائیلی ڕوخساری تۆیە سەیری تەنویرم بکەن
بێ تەمیزی تۆ وەکی تر فەیلەسووفی عالەمی
با ڕەقیبی سەگ هەموویان بێن و تەکدیرم[3] بکەن
شەرتی من شەتره[4] لەبۆ ژینی هەیوولا و سوورەتم
لایەزالم[5] وەك ئەزەل بوو سەیری تەفسیرم بکەن
بەندە بەندەی چاوی تۆم و سەد کەڕەت فەتوا بدەی
بمکوژن خزمەت ئەکەم لەم بیره تەفیرم[6] بکەن
ڕۆحی (نەوحی) بۆ بەنازی، بازی چاوی تۆ ژیا
بەندە زۆر مەمنوونی تۆم و عەفوی تەقسیرم[7] بکەن

---

١- تەنفیر: لە (نفی)یەوە هاتووە: دان پێدانەنان، بەرپەرچ دانەوە، دەرکردن، حاشاکردن.
٢- سوورەت: وێنە، شێوە.
٣- تەکدیر: ئازاردان، سەرزەنشتکردن.
٤- شەترە: ئەمە پێی دەڵێن: هونەری ڕەوانبێژی ناتەواو.
٥- لایەزال: تائێستا، بەردەوام.
٦- کورتکراوەی وشەی (تکفیر)ە.
٧- تەقسیر: کەمکردنەوە، کورتکردنەوە.

# که زوڵفی هاته سەر ڕوو

کە زوڵفی هاتە سەر ڕوو وام ئەزانی ڕۆژە ئاوا بوو
بە پەنجەی تارو ماری کرد و تیشکی دایەوە وا بوو
برۆ و برژانگ و زوڵف و خاڵ و خەت پێنجە لە سەر ڕوویا
کەسێ ناخوێندەواریش بێ لە خەتتی شارەزا وا بوو
چ پێویستە بە لەشکر یانی زوڵف و خاڵ و ئەگریجە
بە شمشێری برۆ جەرگی بریوم تازە ساوا بوو
بە دووری جۆشیدا دەردی بە غەمزە هاتە دەرمانی
شیفای دەردی گرانیدا ئیشارەی چاوی ئاوا بوو
ڕەقیب تۆ شێتی نازانی! بەسە ئینکاری ئەم کارە
لە وێرانەی دڵی هەر کەس بکا یادی کە ئاوا بوو
بەڕێزی عاشقانا خەیمەیی[1] خەتمەی کە دا پۆشی
بڵێسەی ئاگری نیسبەت بە سەر جەرگ و دڵا وا بوو
عەزیزم عاشقانی زوو هەموو مەردانە و دڵ گەورەن
وەرە سەر ڕۆحی (نەوحی) چونکە دڵ منداڵ و ساوا بوو

١- خەیمە: چادر، ڕەشماڵ.

## ساتێ بۆ شووشەی دڵم

ساتێ بۆ شووشەی دڵم خاڵی لە شووری غەم نەبوو
ڕۆژی سەد چۆڕی ئەنۆشم، بۆ قومێکی کەم نەبوو؟
من لە مێژێ کەسبی زانستی[1] غەمی تۆم کردووە
هەر بە دەرسی حاشییەی زوڵفت خەیاڵم جەم نەبوو
شیعرو هۆشی من پەرێشانە وەکو زوڵفانی تۆ
بۆیە دیوانم لە چاپی چینی سەر پەرچەم نەبوو
چایی فرمێسکم دەمی کێشا پیاڵەی دڵ شکا
قەدری قەندی[2] وەسڵەکەت بۆ قیمەتێکی کەم نەبوو
تاکو خوێنی دڵ لە جۆگەی چاوەوە جاری نەبوو
بۆ قیاسی دووری تۆ ئیزهاری کەیف و کەم نەبوو
دڵ لە دەشتی دووری تۆ قاچاخی دەستی خاڵتە
بوو بەداوی چینی زوڵفیشی کەچی مەحکووم نەبوو
بێ نەبیرە[3] مایەوە ڕەنجی من و گەنجی ئەتۆ
(نەوحی) مەعلوومە لە دونیا مەردم و نەردم نەبوو

---

١- کەسبی زانستی: وەرگرتنی زانیاری، بەدەستهێنانی زانیاری.
٢- قەند: شەکر، کەللەشکر، شەکری کلۆ.
٣- نەبیر: ئەنجام.

## هەناسەت دوکەڵاوی کردم

هەناســـــەت دوکــــــەڵاوی کـــــردم ئــــــەمڕۆ
بـــــەزەبیت بــــێ بـــــە حــــاڵی دەردم ئـــــەمڕۆ
ئەگـــــەر ســــووچ و گونــــاهێکم هەیـــە خــــۆت
کــــە لــــێم خۆشـــبە هەناســـــە ســــەردم ئــــەمڕۆ
ئەگــــەر ڕەحمــــت نـــــەبێ تــــۆش وەك نــــەیاران
بزانـــــــە وا لـــــــە مێـــــــزا مـــــــەردم ئـــــــەمڕۆ
خـــــــەیاڵت لەشـــــــکری هێنایـــــــە ســـــــەر دڵ
لــــەبی وشــــکی بــــە خــــوێن تــــەڕ کــــردم ئــــەمڕۆ
کــــە ســـــەرداری مـــــژەت ئــــەمری وەهــــا بــــوو
دڵ و دینــــــی لـــــــە دەس دەرکــــــــردم ئـــــــەمڕۆ
لــــە ئـــــەم شــــارە کەســــێ دۆســــتم نــــەماوە
لــــــە خانــــــەی بێکەســــــیدا فــــــەردم[1] ئــــــەمڕۆ
لــــە بــــۆ (نــــەوحی) مەگــــەر هــــەر ئــــەو پزیــــشکە
بکــــــا دەرمــــــــانی زام و دەردم ئــــــــەمڕۆ

---

١– فەرد: تەنیا.

## لە ناو ئاوێنەی ڕوویا

لە ناو ئاوێنەی ڕوویا خۆمم دی هەر وەکو بەی بوو
لە تاوی ڕوومەتی ئاڵامە قەددی هەر وەکو نەی بوو
بە لەعنەت بێ نەیار نەیهێشت کە بێمە سەیری ناو باغی
دەمی غونچەی سبەینێیە بە غەمزە لێو بە خەندەی بوو
لە ئاینی ئەپرسم بۆچی ئەم خەڵکە ئەسووتێنێ...؟
ئیشارەی چاویە تێلسز[1] لە دڵ ئیخبار ئەداکەی بوو
نەیار هۆشیارە، هۆشت بێ وەکو ڕادیۆ وەری ئەگرێ
وتم قوربانی تۆ چاوم ئەمن بیری ئەمەم کەی بوو
ئەوەن منداڵ و بێ شەرمە، ئەوەن سەر بەست و دڵ نەرمە
ئەوەندە ژیرو دەم گەرمە هەتاکو دوور لە مامەی بوو
نەباتی لێوی ئەو بۆ من، لە باتی ڕووی ئەوە بۆ من
ئەڵێ ئەی قوربەرسەر ئەم دەردە بێ دەرمانەتە کەی بوو؟
لە برژانگی بپرسە سوننییە یا شیعەیە یا خوو؟
بەریدی پۆستەیە بۆ دڵ ئەهێنێ ئێشییەکەی کەی بوو
کە دوومەی سوخمەکەی سینەی ترازان و هەتاو کەوت
سبەینێ نوێژەکەم ڕۆیی وتی ئێ ژەقنەمووتەکەی بوو
وتی (نەوحی) ئەمەندە بۆچی سەرشێت و پەرێشانی
وەکیلی باغ و باجی ماچ و تەختی سینەکەم کەی بوو؟

---

١- تێلسز: بێتێل، مەبەست لە تەلگرافی بێتێلە، بێتێل هەواڵ دەگەیەنێت، لێرە مەبەستی لە چاوی یارە کە بە بێ تێل ئاماژە دەکات و هەواڵ دەگەیەنێت و ڕادەگەیەنێت.

## دڵم فارغ نییه

دڵم فارغ نییه یەك لەحزە بێ تۆ
بەهەشتم دۆزەخە ئەمڕۆ بەبێ تۆ
ئەگەر ساتێ لە لام بیت و نەمێنی
بەگریانۆ ئەڵێم یاخواکە بێیتۆ
هەموو کەس بابزانێ ئێشی دەردم
لەگەڵ تۆ چوونە هەم چوونە بەبێ تۆ
ئەوەندە دوور لە بیرو هۆشم ئەمڕۆ
ئەوەی کەر بێ ئەدا وەعزم بەبێ تۆ
ویسالٚت موتەسیل کەم تازە ئەمڕۆ
بە کەیفم مونفەسیل[1] ناحەزمە بەبێ تۆ
شەوی وەسڵت لە بۆ من تا قیامەت
جلووسی شاهییە[2] بەم حاڵە بێ تۆ
دڵم سەرخۆشی چاوی نەرمی تۆیە
وەکو (نەوحی) بەمەززەی دوو لەبی تۆ

١- مونفەسیل: جودابوون، پارچەپارچەبوون.
٢- جلووسی شاهی: نیشتنی پاتشاهی.

## پێویستی ژیانم

پێویستی ژیانم بۆ ماچی دەم و لێوی تۆ
یا عارەقی بەرگەردن یا کوڵمی کە سێوی تۆ
جێی داخە کە ڕوو شیرینی، ترشی ئەکەی ئەمڕۆ
سوێندم بە سەری کوڵمی سێوی نە گەزیوی تۆ
ئەم جووتە نە یارەی من وەك دایكی وەتەن ئەمڕۆ
بۆ گوردی[1] زەمان شێرە بۆ غەیرە کە ڕێوی تۆ
هەورێکە بە ڕوویا هات وامزانی کە ڕۆژ گیرا
ئەم هۆشە پەرێشانە وەك زوڵفی پەشێوی تۆ
فورسێکی لە مێژوودا کوردن فەقەت ئێستاکە
هەورازە نیشانەی ئەو بەرزێکە نشیوی تۆ
(ئازەر)[2] کە بوتی تاشی کێ بوو بە بوتی شاشی
ئێستە نەتەوەی ئەو بوو ئاڵتوونە کە زیوی تۆ
بۆ (نەوحی) وەها چاکە ناوێکی لە نێو نێوان
لەم ناوە بمێنێ چۆن پێویستە بژێوی تۆ

---

١- گورد: چاپووك و بەكار.
٢- ئازەر: باوكی ئیبراهیم خەلیلوڵلایە.

## بەس دڵم بشکێنە

بەس دڵم بشکێنە حەیفە توخوا ئەی ماه ڕوو
ذلك خير، لك لكنك لاتشعرُ
دڵ بریندارە لە سەد لاوە بە تیری چاوەکەت
هادم جرح الفؤاد مع دموعي يقطُرُ
چاوی بیمارت هەزار جەوری سیاسەت لاهەیە
من يصومُ ان رِآها كيف ان لايفطّرُ
بێ خەتایە دڵ لە شاری چینی زوڵفت دادەنیشت
لاتعذبني بها من نال فيها ينظرُ
ڕۆژی سەد جاری ئەگەر لەتلەت بکەی جەرگ و دڵم
لاتظن سوء ظن كان قلبي يخطر
چاوەکەم چا بێنە ساقی کورد بە گۆرانی ئەڵێ
من ترا عين حبيبي خفية لايحذرُ
پیاڵەیە لەو عارەقەی بێنە کە شێخ سەرخۆش ئەکا
ان (نوحي) يسكرُ كيف اذا ما ينظرُ

## وا جەژنە هەموو کەس

وا جەژنە هەموو کەس لە سەفاو عەیش و نەشاتە[1]
بۆ من کە غەریبم غەمی تازەم بە خەڵاتە
سەیری چییە سەر چیمەن و پرد و لەبی ئەڵوەند
بەو چاوە کە خوێناوی دووری و نەهاتە
ئەگەر نییەتی تاوی هەتاوی سەری کوڵمی
ئەو یارە لە شەودا خۆیەتی حاکمی کاتە
سوبحانە لە چیمەن گوڵ و شەسپەڕ بە نەزاکەت
سەیری خەفەتە بۆ من و بۆ ئەو چو حەیاتە
ئەی ساقی شەرابێ بدە سارێژی غەمم بێ
دڵ خالی لە شەوق و بە غەمی زوڵفی سیاتە
خەرمانی گوڵی ڕووتە لە بەر ئاخی شەماڵم
دەم بێنە بدە ماچی لەبت کاتی زەکاتە
ئەم جەژنە لە میحرابی بڕۆت سوژدە دەبەم من
وەك (نەوحی) کە مرد و غەمە هێشتا بە تەماتە

---

١- نەشات: چالاکی، گورج و گۆلی، چاپووکی.

## ئەم ئاوە کە چەن ڕوونە

ئەم ئاوە کە چەن ڕوونە ئەڵێی ئاوی حەیاتە[1]
یا عارەقی بەر گەردنی کاڵییە کە واتە
بۆ دەردو برینی دڵی من ئێستە شیفایە
شیرینە لە هەنگوین و ڕەوانتر لە نەباتە
هاتویتە کەبابخانەی دڵ ڕەببی بەخێر بێی
تۆ جەرگت لە سیخداوم و هێشتاکو تەماتە
بۆ مەززە و ترشی بە لەززەت بێتو بسووتێ
ئەم گیانە لە ئەم سینەیە ماوە بە تەماتە
سۆسەن[2] کە بەرەو ژوورە زمانی لە دووسەد لا
بۆ چاوی ئەتۆ یاسەمەنەی دەستە دوعاتە
هەردەو کەژ و کۆی زەنگنەیە ئێژی بەهەشتە
بێ تۆ وەکو ڕووم زەردە ئەڵێی دەشتی بەیاتە[3]
ئەو عارەقی ڕووتە کە وەکو شەونمی ڕووتە
بۆ تاوی دڵی (نەوحی) ئەلەرزێنێ نەجاتە

---

١– ئاوی حەیات: ئاوی ژیان.

٢– سۆسەن (سۆسن): جۆرە گوڵێکە کە چەند ڕەنگێکی هەیە.

٣– بەیات: هۆزێکی عەرەبن لە دەوروبەری شارۆچکەی سلێمان بەگ نیشتەجێن، هەروەها ناوی یەکێك لە (مەقام)ـە لە هونەری گۆرانی وتندا.

## ئەم مەجلیسە ئەمشەو

ئەم مەجلیسە ئەمشەو کە ئەڵێی باخی بەهەشتە
خوسرەو کە غولامی حەرەمە[1] شێرۆ[2] لە دەشتە
تاجی سەرەتاجی بە کەوا و سوخمەیی تاقە
هەرچەندە ئەخوێنێ غەزەلی بەزمی فریشتە
موتریب کە ئەخوێنێ بە هەواو نەغمەیی داود
سۆفی لە سەمماع[3] دێتەوە مالووم[4] لە کەنیشتە[5]
ساقی وەرە جامێ بدە عیشوە[6] مەفرۆشە
پەنجەت لە خەنەی گرتووە بەم تەرزە ڕەوشتە
بۆ بەندی سەری قۆندەرەکەت پێنجە لەجێی دوو[7]
گیان و سەرو ماڵ و دڵ و دینم کە پەرۆشتە
کێ دیویە گوڵی ژاڵە نەبێ تاڵە لە باخا
دڕکی نییە ئەم تاقە گوڵەم وا لە تەنشتە
بایی هەموو عومرێک و ژیانێکە لەمەو پێش
دانشتووە (نەوحی) لە بەرابەر بە فریشتە

---

١– حەرەم: ئەو ژوور و جێگەیەی کە ژن و منداڵی لێدەژی. ناوەوەی خانوو و ژوور، ئەو جێگەیەی کە پیاو دەیەوێت بیپارێزێت.

٢– شێرۆ: کوڕی خوسرەو پەروێزە.

٣– سەمماع (سماعخانە): گۆشەیەکە وەك خەڵوەتخانە. لەوێدا، دەروێش و سۆفییەکان گوێڕایەڵی پیری تەریقەتەکەیان دەبن و زۆر دەبیستن، سەمماع: گوێڕایەڵ، زۆربیستن.

٤– مالووم: زانای ڕۆحانی جوو (یەهوود).

٥– کەنیشتە: کەنشت، پەرستگای جوو.

٦– عیشوە: ناز، لووتبەرزیی و لە خۆبایی لە ڕووی جوانییەوە.

٧– واتە بۆ پەتی (قەیتان)ی قۆنەرەکەت کە دوانن، من پێنج دانەم بۆ ئامادە کردوویت: گیان و سەر و ماڵ و دڵ و دین کە هەر هەموشیان بۆت بە پەرۆشن.

## من له دووری تۆ غەمین

مـن لـه دووری تـۆ غـەمین و عـاجزم بـەم غوربەتـه
عـارەقی ڕووتم ئـەوێ شـیرینه، وێنـەی شـەربەته
ماچـی لێـوت دابنـێ بـۆ مـەززەو خۆشـی دڵـم
جـا سوپاسـی تـۆ ئـەکا بـەو نـازو کـام و ڕەحمەتـه
عەکسـی ڕووتـه وا لەبـەر دیـدەی دڵـم ڕوونـی ئـەکا
چـاوی مـن بێـت و نـەبینێ دوور لـه تـۆ جـا زەحمەتـه
چـونکه پـێ بەنـدە لـه کفـری زوڵفـی ئاڵۆزاوەکـەت
خـەتتی خاڵـت بـوو لـه دەرسـی جـەبر و کـاتی حیکمەتـه
بولبـولی دڵ دێتـه سـەیرانی گـوڵی ڕوخسـاری تـۆ
خونـچەی دڵخـوازی (نـەوحی) بۆ نە پشكووت حیکمەتـه

## ئەو دووکەڵە ئەمشەو

ئـەو دووکەڵـە ئەمـشەو کـە ئـەڵێی دووکـەڵی نەوتـە
یـاخۆ گـڕی قرچـەیی دڵەکـەی شـەو نەسـرەوتە
بەرقاعیـدە[1] ئـەمجارە وەرە وەختـی ویـساڵە
چـۆن دڵ لـە مـەراقت وەکـو جەوهـەر بـووە بووتـە
بەنـدە چ خەتایـەکی هـەبوو وا دڵـت ئێـشا
ئـەی مـن بەفیـدای غـەمزەو نـازێکی کـە بووتـە
پاکانـە ئەکـەم بـۆ تـۆ کـە پەنـدە ئەیفرۆشـم
تـەرکی بکـە وا چـانییە ئـەو نـازە کـە خووتـە
تـا ڕۆژی قەیامـەت بـە مـەراقت وەکـو (نـەوحی)
پـێم خۆشـە لـە بـەر مـاچ و خـەڵاتێکی کـە بووتـە

---

[1]- بەر قاعیدە: ڕاست و دروست.

## خانەقا و مزگەوتە بۆ تۆ

خانــەقا و مزگەوتــە بــۆ تــۆ مەدرەســە بــۆ مــن بەســە
مــن جەهەننــەم بــێ ئەســازێنم بــە یــادی ئــەو کەســە
دوژمــن و دۆســـت و نـــە یـــارم پێکـــەوە ڕێکـــەوتوون
عــارەقی ڕووتم ببـــێ بـــاکم چـــییە لـــەم وەسوەســـە
گـــەر چـــی ئێـــستاکە بـــە دینـــت کـــافرێکی موتڵـــەقم
هـیچ موقەییـەد نـیم سـوکووبا[1] شـاهیدە بـێ ئـەو کەسـە
پــەڵپی ئــازادی لــە چــاهی غــەم دەمێکــە قــووت ئــەخۆم
لای کلیـــساوە بـــە بـــازاڕا نـــە یـــارت حەسحەســـە
تۆبــەکاری دەســـتی ڕوهبــانم لــە هێــزی بــتم ئــەوێ
خـــانووی دینـــی بڕوخـــێ ئـــەو نـــە یـــارەی ناکەســـە
چـــاوتم بـــێ چـــاوەکەم مـــەژگم پـــڕژێ[2] بـــاکم نییـــە
کــاڵێ وا یاســـینم ئـــەخوێنێ پیـــێ بڵـــێن شـــینم بەســـە
چـاوی نـەرمی کـاتێ هـەڵبێنێ بـە عیـشوە و نـازەوە
مـاڵی (نـەوحی) بـە فیـدای ئـەو غـەمزە بـەو دوو نێرگسە

---

١– سوکووبا: قەشە، کەشیش، دەڵێن گوایە ئەم قەشەیە لە کاتی خۆیدا کەنیسەیەکی بینا کردووە، عیسا پێغەمبەر (د.خ) بەسەریا چووەتە ئاسمان.

٢– پژێ: پژان، پرژان.

## هەناسەی ئاخی سەردم

هەناســـە و ئــاخی ســـەردم باوەشـــێنی ڕۆژی ڕووناکـــە
ئــەڵێ ماچــی مەکــە بۆچــی لــە تــامی دەرئەکــەی کاکــە
لـــە دووری دیدەکـــەی یـــارم ئـــەڵێی بیمـــاری دوو مـــارم
لـە ئـاخی چـاخی[1] هـاوارم ئـەوەن بـێ ڕەحـم و بێباکـە
کە وەستا بووم لـە ئـەم لاوە بـە غـەمزە ئەو هـەڵۆ چاوە
وتــی: هێــشتا وەفــام مــاوە بــەڵام کــاتی نییــە ڕاکــە
وتم: بۆچــی بــە پیتــی ناحــەزم بــاوەڕ ئەکــەی چــاوم؟
وتــی: خــاڵم خــەتی نووســی مەگــەر ئــەو بیکــوژم چــاکە
وتم: مایـــەی ژیـــانم بـــۆ دیـــاریی دووریـــی تـــۆ بـــوو
وتـــی: دوورو نـــزیکیم بـــۆ نییـــە لـــەم بـــیرە هاشـــاکە
وتم: بـــۆ تـــیری برژانگـــت کـــەوا هاویتـــە[2] نـــاو جـــەرگم
وتــی: بــۆ زامــی دڵ ماچــی لــەبم کــە مەرهــەمی چــاکە
وتم: دوو مــاری زوڵفــت بۆچــی گــازی گرتــە دڵ، چــاوم
وتـی: ئـەو بـێ ئیجـازەم هـاتووە، کـەم (نـەوحی) بێباکـە

---

١- چاخ: ساز و بەکەیف.

٢- هاویت: هاویتن، هاویشتن، ئاویتن، فڕێدان.

## گەر نەبێ فیتنە عەزیزم

گــەر نــەبێ فیتنــە عــەزیزم پێــت دەڵــێم ئەمجارەکــە
چــاو مەڕێــژە فیتنــە هەڵگێرســێنە بــۆ ئــەم شــارەکە
چــاوی کــاڵ و لێــوی ئــاڵ هــەر خــۆی پەســەندی عالەمــە
هــاتو زوڵفــی لۆلــۆ خــاو بــوو کــرژ ئــەکا دڵدارەکــە
ئــــەو ســــەرۆکی دڵبەرانــــە کۆمــــەڵی فــــەوتانووە
چــونکە نــازی خــۆی لەبــەر چــاوی ئــەمن ئینزارەکــە[1]
جــا وەهــا بــێ چــا وەهایــە پــۆلی عوشــشاقت نــەبێ
بۆچــی پــەیمانت شــکان کەوتیتــە لەنجــەو لارەکــە
داخەکــەم تــەنگاوی ســاتێ بــۆ هیــوات دایــە هــەوا
چــۆن بڵــێ (نــەوحی) کــە دڵــسۆزی ئــەتۆ غەددارەکــە

---

١- ئینزار: ئاگادارکردن.

## زوڵفی شەوە

زوڵفـــی شـــەوە بـــاڵای وەکـــو نەوتوولـــە نەمامـــە
غـــەمزەی غـــەزەبی چـــاوی ڕەش قـــاتلی عامـــە
بـــۆ بەنـــدی دڵ و جـــەرگی منـــە داوی کـــە دانـــا
ئەگریجـــەی دەقـــداوە ئـــەڵێی ڕوشـــتەی دامـــە
یاقووتـــە لـــەبی قووتـــە لـــەبۆ گیـــانی مـــن ئێـــستا
یـــا ڕووتـــە کـــەوا ڕوونـــە ئـــەڵێی مـــانگی تەمامـــە
زنجـــیری عەدالـــەت[1] نییـــە زوڵفـــانی کـــە بۆیـــە
مەیخانـــە و مزگەوتـــە وەکـــو دەشـــتی قیامـــە
(نـــەوحی) بـــە ســـەفەر هـــاتو گرفتـــاری غـــەمێ بـــوو
پێویـــستی خەفەتبوونـــە بـــە گووشـــینی شـــەمامە

[1]– زنجیری عەدالەت: دەگێڕنەوە نەوشیروان کە پاتشایەکی دادپەروەر بووە، زنجیرێکی درێژی ئامادەکردبوو، سەرێکی لە ژوورەکەی خۆیدا بوو، ئەویتریشیان لە دووری کۆشکەکەی بوو، هەر کەسێك کێشەیەکی هەبوایە، سەری ئەو زنجیرەی دەگرت و ڕای دەوەشاند، نەوشیرانیش دەستبەجێ دەینارد بە دوایدا و گوێی لێ دەگرت و کێشەکەی بۆ چارەسەر دەکرد، جا ناوی ئەو زنجیەرەیان نا (زنجیری عەدالەت). نەوحی دەیەوێت زوڵفی یارەکەی وەك زنجیری عەدالەت بێت و خۆیشی وەك نەوشیروان هەر کاتێ بیەوێت ڕای وەشێنێت و دەبێت خوازیارەکەی بەجێ بێنێت.

## له چاوم ڕێ ئەکا فرمێسک

لـــە چـــاوم ڕێ ئـــەکا فرمێـــسک و چـــۆمی دڵ پەرێـــشانە
شـــەپۆلێدا بـــە قووتـــا چـــووم بـــە وێنـــەی پـــۆلی کوردانـــە
مـــن و غـــەم هـــاوڕێین و ئـــەو دڵـــی نایـــە بـــەجێم بێنـــی
لـــە داخـــی ناحـــەز و دوژمـــن دڵـــم ئێـــستاکە پـــڕ ژانـــە
لـــە ئـــاوی زەمزەمـــا بیـــشۆی نـــەیارم پاکـــەوە نـــابێ
وەکـــی تـــر وا چـــووەتە بـــیری خـــەڵکی قـــوتبی ڕەببانـــە
لە ڕێی عەشقایە ئاسک شێر بەگوێ ئەگرێ لە نێو بێشە
کـــە بۆیـــە داوی زوڵفـــی یـــار ئـــەڵێی زنجـــیری مەردانـــە
بـــە لـــەرزو تـــاوی دووریتـــە دڵـــم بـــرژاوە قرچـــەی دێ
لە (نـەوحی) بۆچـی ناپرسـی کـە چـاوی پـڕ لـە گریانـە؟

## مەڵێ سوودی نییە مردن

مەڵێ سوودی نییە مردن لە پێش ئەو چاوە کاڵانە
شەهیدە تا قەیامەت زندووە بەو لێوە ئاڵانە
سبەی ناچێتە بەر چینی گوڵی ڕووی بە عەرەق چینی[1]
لە بەر شەمعی شەبیستانی[2] لە ژێر پەرچینی خاڵانە
بە فەتوای پیری مەیخانە زەکاتی ماچی لێوانی
بە گیان و سەر بیسێنی باوەڕت وا بێ کە تاڵانە
لە شۆری لێوی شیرین ڵاڵە فەرهاد و بڵێ خوسرەو
لەئێشی شیری شێرۆ دەردەدار و دڵ بە ناڵانە
چڵێ برژانگی چاویدای لە جەرگی (نەوحی) و هۆشی
لە بارمتەی شەرابی، ڕوومەتی نا بەو خەیاڵانە

---

١- عەرەق چینی: ئەو دڵۆپ عارەقانەی کە لە ڕوومەتی ئازیزەکەی بە ڕیز دەچۆڕێن.
٢- شەبیستان: ژووری نوستنی ژن و منداڵ، خەڵوەت، هەیوانی مزگەوت.

## ژیانی ڕوومەتی پەرژین کراوی

ژیانی ڕوومەتی پەرژین کراوی پەرچەمی خاوە
کە داماوم لە شاری ڕووی گوڵی پڕ داغی ئەولاوە
سەڵیبی[1] ئەرمەنە زوڵفی بە لاگیرە[2] قولابی گیر کرد
لە ئەم پەرچینی زوڵفی بووم دڵی بردم لە ئەولاوە
لە زیڕەی بەر سەری[3] لیرەی سەری سەرسام و داماوم
لە پێچە ڕوومەتی دەرکەوت ئەڵێی ڕۆژە لە خۆرئاوا
تولووعی ڕۆژە بۆچی ئەم سەرەو سەر بێ خوا تەوبە
بە زانینی پزیشکی کە ئەزانێ عیللەتم ماوە
گڕەی دووریم لە دڵدایە مەگەر بکرێتەوە لای خۆی
لە غەمزە و نازی ئەو یارە هەموو پوختەی لەلا خاوە
لە شاری وەسڵی دەرکەوتم بۆ کەسێ ناحەزی کەوتم
لە حەڵقەی زوڵفی بەرکەوتم (تعال الله) لە ئەم داوە
بە ئەم جەژنە لە ئەو بەژنەو قەدو باڵا نە ئاڵاوم
سەفای عاشق بە خاڵی ڕوو لە مەروەی[4] زوڵفی جێماوە
بە شمشێری بڕۆ کوشتاری قوربانی ئەکەی قوربان
بە زنجیری سەری زوڵفت چ پێویستی چ قەوماوە؟
هەموو کوردێ بە مەشقی عەشقی تۆ یەك نەزم و دوو بەزمە
لە غوربەت دوور لە تۆ (نەوحی) بە تەنیا وێڵ و داماوە

١- سەڵیب: خاچ، دوو شتی ڕاست و چەپە لە زێڕ یان لە زیو یان لە شتێکی تر دروست دەکرێت و دروشمی مەسیحییەکانە.
٢- لاگیرە: زەنبەرێکە بەلای سەرەوە قایم دەکرێت.
٣- بەرسەرە: جۆرە پلپلەیەکە لە دەوروبەری کڵاوزەڕی ژنان بەند دەکرێت، لە زێڕ یان زیو یان ورشە ئامادە کراوە.
٤- سەفاو مەروە: الصفا والمروە.

## پێنج خشتەکی ئەوحی لە سەر غەزەلێکی زێوەر[١]

لـــە دیـــدە عـــەینی فرمێـــسکم چـــەمی ڕێـــژاوە[٢]، ڕێـــژاوە[٣]
لـە ســەد لا ئاشــی میحنــەت بــەو چــەمەی ســووڕاوە، ســووڕاوە
لـــە تـــۆ دڵ بولبـــولیش بـــۆ گـــوڵ چـــلۆن[٤] جێمـــاوە، جێمـــاوە
حەواســـم[٥] هـــەر وەکـــو زوڵفـــت چـــلۆن شـــێواوە، شـــێواوە
دڵـــم وەك خـــاڵی ڕوخـــسارت چـــلۆن ســـووتاوە، ســـووتاوە

لـــەجێی هـــاوینی وەســـڵی تـــۆ بـــە زســـتانت هـــەوەس دێنـــێ
لـــە بـــەزمی فارســـیدا نـــەزمی شەبیـــستانت هـــەوەس دێنـــێ
دڵ و ڕۆحـــم بـــە کـــوردی هـــەر مەســـتانت هـــەوەس دێنـــێ
ئەگـــەر تـــۆ ســـەیری سەرچـــاوەو گوڵوســـتانت هـــەوەس دێنـــێ
سوروشـــکم[٦] ڕەنگـــی گـــوڵزارە وەرە سەرچـــاوە، سەرچـــاوە

موهەییابـــە[٧] ئـــەوا پاشـــا نزیکـــی چـــوونە ســـەر تەختـــە
لـە بـۆ دۆسـتی نـەوەك دوژمـن عـەجائیب ئەمرەکـەی سـەختە
ئەگـــەر ســـەبریش[٨] بهێنـــێ باعیـــسی تەوفیقـــە[٩] ئـــەم جەختـــە
لـە بـەختی مـن ڕەقیـب یـارەببی چـەندە شـووم و بەدبەختـە
بـــەرەو ڕوو هـــەم شـــەرم ناکـــا، ئـــەڵێ: بـــەو لاوە، بـــەو لاوە

---

١– زێوەر: ناوی عەبدوڵڵا کوڕی محەممەد کوڕی مەلا ڕەسووڵە، لە ساڵی (١٨٧٥ز) لە شاری سلێمانی لە دایك بووە. شاعیرێکی نیشتیمانپەروەر و کوردێکی دڵسۆز بووە. لە ساڵی (١٩٤٨ز) کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان بە خاك سپێردراوە. دیوانەکەی لەلایەن مەحموود زێوەرەوە ئامادەکراوە و لە ساڵی (٢٠٠٣ز) لەلایەن دەزگای ئاراسەوە لە چاپ دراوە.
٢– چەمی ڕێژاو: پانتاییەکە دەکەوێتە سەر ڕۆخی ڕووباری ئەڵوەند لەسەر ڕێگای ئارامگەی بابا یادگاری کاکەیی و نزیك بە گومەزی ئیمام (دووجانە). چەند ئاواییەکی لە خۆ گرتووە، لەوانە (بانمەزلاران، شالآت، باوەجانی ژووروو، باوەجانی خواروو، کانی ڕەش، ژاڵەکە، یاران، قوڵقوڵە) خۆم بۆ چەند جارێك لەساڵانی (٢٠٠٦، ٢٠٠٧، ٢٠٠٨) ئەو دەڤەرەم بینیوە.
٣– ڕێژاو: پەرێشان و بڵاو.
٤– چلۆن: چۆن.
٥– حەواس: پێنج هەستیارەکەی مرۆڤ (بیستن، بینین، چەشتن، بۆنکردن، بەرکەوتن).
٦– سوروشك: فرمێسك.
٧– موهەییا: ئامادە بوون، کاری ئامادەکراو.
٨– سەبر: ئارام، مەبەست لە پژمینە، لە کوردەواریدا ئەگەر یەکێ بیەوێت بۆ شوێنێك تۆغر بکات، ئەگەر یەکێك لەو کاتانەدا یەك جار بپژمێت دەڵێن (سەبری هێنا) جا هەندێ سەبر ئەکا ئنجا لە تۆغرەکەی بەردەوام دەبێت، یان لە تۆغرەکەی پەشیمان دەبێتەوە، خۆ ئەگەر هات و کابرا دووجار لە سەر یەك پژمی، ئەوە دەڵێن جەختی هێناو لە سەر تۆغرەکەی زۆرتر سوور دەبێت و دەڕوات.
٩– تەوفیق: گونجان، سازاندن.

## سلێمانی هەموو

سلێمانی هەموو کوردێکی ساغن
لە مەردیدا هەموو خاوەن وەجاغن
بەڵام بیریێ هەیە تەرکی بکەن گەر
ئەڵێم ئینجا لە نێو کوردا چراغن[1]
ئەڵێن ئێمە نەبێ کوردێ ئیتر نین
ئەمە بێ حیکمەتە وەك باغ و زاغن
ئەوەن گۆران و کورد زۆرە لە دنیا
لە وەقر و[2] هەیبەتا وەك کێو و شاغن
ئەوەی کوردە لە نێو گۆران و کوردە
لەبۆ دوژمن ئەو ئێستا وا بە داغن
وەکو کاوە هەموو هاتوونە مەیدان
جگەر سوتاو هەموو خاوەن بەیاغن[3]
لەوەی پێویستە بۆ سەر بەرزی ئەیڵێم
هەموو بۆ یەك وەکو یەك پڕ دەماغن[4]
بە کەڵکی یەکتری ئێن[5] و ئەپرسن
لە شار یاخۆ لە دێهات و لە باغن
نەبێ فەرقی سلێمانی و هەموو کورد
هەموو دووربن لە غیرەت، وەك قەراغن
بەڵام (نەوحی) ئەمەندەی لێ دەزانێ
ئەوەی مێشکی هەیە، خۆ بێ دەماغن

---

١- چراغ: چرا.
٢- وەقر: سەلار، سەنگین، بەڕێز.
٣- بەیاغ: بەیداغ، بەیداخ، ئاڵا.
٤- دەماغ: کەیف، خۆشی. بە مانای (لووت- کەپوو)ش دێت.
٥- ئێن: دێن.

## ئەی کۆمەڵ ئارا

ئەی کۆمەڵ ئارا[1] وەتەن پەروەران
بۆ بیریٚ ناکەن لە واتەی دەوران؟
نامیلکەی واتەی کۆمەلایەتی
نووسیویەتیەوە بە زمانی گۆران
(کۆگ ئاڵب) بەگی[2] زانای کوردەکان
مامۆستای مێژوو زانستی دەوران
لە (دار الفنون)[3] لە ئەستەموولا
بیری داوەتە نەبیرەی گۆران
ئێستا کە (رەفیق حیلمی) جەنابی
چاپی کردووە بۆ کورد و گۆران
کوردانی خاکی عەرەبی و رۆمی
یەکجا کوردانی کەوان لە ئێران
ئەوەی عەشرەت و لادێیەکانە
پاراستە مابوون بە بۆنەی بیریان
بەلام برێکیان ئەچوونە شاری
تورك و فارسەکان، زوانیان ئەگۆڕان
هەر بە گاڵتەوە لە خۆیان ئێکدا
نە بارەکەڵلا لە بیری گۆران
گەر باوەڕ ئەکەی جاف بیری چا بوو
کوردایەتی خۆی ئەو نەکرد وێران
چوون لە بناغە کورد هەر ئەوانن
ئێمە کوردانین بووین بە گۆران
هەرچی گۆڕرا، بوو بە تورکمان

---

١– ئارا: دۆست، خۆشەویستی.

٢– کۆگ ئاڵب بەگ: ناوی ڕاستەقینەی (زیائەدین گۆگ ئەڵب بەگە)، نووسەر و شاعیرێکی تورك بووە. نامیلکەیەکی بەزمانی تورکی لەسەر گیروگرفتی کۆمەلایەتی کورد داناوە. مێژوونووسی بەناوبانگی کورد، مامۆستا (ڕەفیق حیلمی ١٨٩٨–١٩٦٠ز) ئەو نامیلکەیەی گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردیی و لە ساڵی (١٩٣٥ز)دا لە چاپخانەی مەعارف لە بەغدا لە چاپی داوە.

٣– دارالفنون: خانەی هونەر، دەزگای هونەر، نامیلکەکەی گۆگ ئەڵب بەگ لەم خانەیە لە ئەستەموول بە تورکی چاپ کراوە.

بەلام لەمەولا ئەی کورد و گۆران
دین و یەکیەتی با بپارێزین
نەبین بەنیشان بۆ تانەی زەمان
(نەوحی) بە کوردی بۆ تۆی داناوە
تۆ بیگرە لە گوێ وەك کوردی جاران

## بێنەوە ڕاوە بە ڕاوە

بێنەوە ڕاوە بە ڕاوە، دەبا شکارێکی بکەین
واین لە ژێر دەستی نەیار و یاریا[1] کاریێ بکەین
تا لە ژێر ئەو سێبەرە دەرچین ئەوا گەڕ[2] بووین هەموو
بۆ برین و ئێشی دڵمان زوو بە زوو چاریێ بکەین
چی ئەبێ گەر هیممەتی خۆت سەرفی ڕێی کوردی بکەی؟
بۆ لە مەودوا وەك لە مێژێ حوربین ئیقراریێ بکەین
قەت وە بیرتان ناکەوێ خوێنی گەشی کوردانی پشت؟
ئێمە دائیم هەر وەکو مندالْ ئەگەر یاری بکەین
ڕێکی ناهێنێ قیباسی سەربەخۆ بێ یەکێتی
تا ئەبەد بۆ ئەو نەتیجە هەر ئەبێ زاری[3] بکەین
ئاشیانەی[4] دالْ[5] و کۆلارەیە[6] ئەو ئێستە مونتەزەم
حەیفە هێلانەی بازی کوردەواری لاری بکەین
شێری تیژو بیری قوولْی نەوجوانانی وەتەن
(نەوحی) پشتیوانمانە ئەگەر وەتەنداری بکەین

---

١- یاریا: یاران، دۆستان.
٢- گەڕ: گەڕی، گرویی، جۆرە نەخۆشییەکی پێستە.
٣- زاری: گریان و شیوەن.
٤- ئاشیانە: هێلانەی بالْندە.
٥- دالْ: دالاش، خەرتل، بالْندەیەکی گۆشت خۆرە.
٦- کۆلارە: کورکورە، بالْندەی جووجەڵەی مریشك ڕفێن.

# بیست و پێنج ساڵە پەشێوی[1]

بیست و پێنج ساڵە پەشێوی شێوەی تۆم ئەی وەتەن
تێپەڕی عومرم هەمیسان تامەی تۆم ئەی وەتەن
باسی باخاتی ئەتۆکەم یا شەپۆلی ئاوی ساف
یا بڵێم دوژمن پەرستی ناحەزی تۆم ئەی وەتەن
تۆکە پشتی ڕۆژهەڵاتی ئێمە بۆیە کەوتوین
تەختی مەنهارت لە نێو تێنووی تۆم ئەی وەتەن
سەرپەچە کۆڵان بە کۆڵان پاکی خواهیشتی منیە
ناو قەلا خزمی ئەمن دڵخوازی تۆ بووم ئەی وەتەن
بێتەوە پیری خەزایی[2] تا بەسەر قەبران هەموو
خۆڵی ئاڵتوون بەردی زەمڕووت[3] بیری لای تۆم ئەی وەتەن
چیمەن و کۆڵانی خوارو تا بە کازم خان[4] هەر هەموو
شەقڵی گەرەک وێنەی بەهەشتێکە لەبەر تۆم ئەی وەتەن
بێ تۆ هەنسەوار باخ و مەسقەفا لوبەیانی کوردی ئێمەیە
باخی خان[5] و کانیباخ[6] ئەو پەرچەم و گۆم ئەی وەتەن
باخی قازی و باخی حاجی باخی قیبلەو میرخوزیش[7]
هەمە ملەتیف ئاوڵەمەنتاکو جامە شیلای شیوەم ئەی وەتەن
بێنەوە گۆمەپەلە پۆو قوشقلانی گشتۆمی بێ پەلێ
ئەتۆزەه پێکڵە وپیردی حیناجی نەسدالحی نوومی ئەی وەتەن
بێنەوە بازاڕی کوردی هەڵگرین کووتاڵی دڵ
من بە نام عێراقە بۆیە دەربەستی تۆم ئەی وەتەن
دێمە نێو بازاڕی شێخ و بۆ گوزەر تێپەڕ ئەبم

---

١- ئەوحی ئەم شیعرەی بۆ زێد و شارەکەی خۆی وتووە کە (سەقز)ە، ئەو شوێن و جێگا و ناوانەش کە لە شیعرەکەدا هاتوون، هەر هەموویان هی ئەو شارە و دەوروبەرەن.

٢- پیری خەزایی: پیاوچاکێکە، گومەزەکەی لەناو شارۆچکەی (سەقز)دایە، ڕۆژانی چوارشەممە خەڵکی دەچنە زیارەتی.

٣- زەمڕووت: بەردێکی بە نرخە.

٤- کازم خان: گەڕەکێکە لە سەقز کە گومەزی پیاوچاکێکی بەم ناوەوە لێیە.

٥- باخی خان: گەڕەکێکە لە سەقز.

٦- کانیباخ: ناوی گەڕەکێکە لە سەقز، کانییەکی تێدایە بە ناوی ئەو کانییەوە ناو نراوە.

٧- میرخوز: گوندێکە لە سنووری سەقزدایە، دەوروبەری ئەم گوندە باخ و برەختی زۆری لێیە، خەڵکی دەفەرەکە بە هاوینان بۆ سەیران دەچنە ئەوێ.

ئەچمەوە لێژی حەمام و شین ئەپۆشم ئەی وەتەن
چەن گوزەر عەتتارو بەززازو خەیات و گوڵ فرۆش
بۆ نەکەم شاباشی تۆ گیان و سەری خۆم ئەی وەتەن؟
بابڕۆینە ڕیزی دوکانی هەموو شیلگەر[1] لەوێ
خەنجەری بیرم بکەم زاخاوی[2] بۆ خۆم ئەی وەتەن
جا بەرابەر خواجە دانیاری زەڕنگەر دانیشم
دەستە ئەژنۆ گوارەی زێڕکا لەبۆ تۆم ئەی وەتەن
تۆ لە گوێچکەی بیری کەیت و بچیە بیری پیاوەوە
بەشکو زاوایە پەیا کەین من لە سەر تۆم ئەی وەتەن
شەش هەزار ماڵە هەموو کورد ئاینی کوردییەتە
دین بە هێزو پڕ دەمارو شافعی تۆم ئەی وەتەن
هەڵپەڕن شاییانە لێدەن وا وەتەن ڕازایەوە
تۆ لەبەر تاقە غەزەل من شین ئەپۆشم ئەی وەتەن
بانگی هەر کێ کەن کە کوردە هەڵپەڕێ لەو شاییە
نەزمی یەکیەتی بە گۆرانی بڵێم خۆم ئەی وەتەن
با لە سەر خۆ و سەر بەخۆیی زاوا بچێتە پەردەوە
ڕێك و پێکی گەردی بەر پێی کوردی تۆ بووم ئەی وەتەن
ئەی وەتەن تۆ خۆشەویستی تۆ حەدیست وا لە سەر
ڕۆیی (نەوحی) تاسەخوازی ڕووی تۆ بووم ئەی وەتەن

---

١- شیلگەر: شیرگەر، وەستای شیر و خەنجەر.

٢- زاخاو: مشتومالکردنی شیر و خەنجەر لەلایەن خەنجەرچی، یان شیرگەرەوە.

## نەوحی لە بەندیخانەدا

نەبا لێیدام نە هەتاو
بەندم سێ مانگە تەواو
هێشتا لەلای ئەو کەمە
نەپرسیوە مەحکەمە
هیچ ناپرسێ لە تاوان
ئایا لەمەم یا لەوان؟
بە خەبەری کازیبە[1]
بووەتە هێزی جازیبە[2]
شەرتی بە دادی وایە
بپرسێ لەو کابرایە
کابرا چلۆنی چاکی؟
فەوزەوی[3] یا بێباکی؟
مەعنای بێباکی وایە
ئیجازەی وا لە کایە
هەر چاوە هێزو پارە
لەبۆ ژیان بە کارە
خزم و برا بە تۆ چی؟
کە تۆ بەندی بە مەرجێ

---

١– کازیب: درۆزن، ناڕاست.

٢– جازیب: ڕاکێشەر، کێشەر.

٣– فەوزەوی: ئاژاوەگێڕ، گێرەشێوێن. لە ساڵی (١٩٥٩ن)و سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوو لە سەردەمی حوکمی (عەبدولکەریم قاسم)دا، ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی و تێکڕای ئازادیخوازانیان بە ناوی فەوزەوی (ئاژاوەگێڕ)ەوە دەگرت و لە گرتوخانەکاندا بەندیان دەکردن، نەوحیش لە ڕۆژی (٢٢ی ئابی ١٩٥٩ن) بەر ئەو شاڵاوە کەوتووە و بۆ ماوەی ساڵێك لەسەر کوردایەتی لە پۆلیسخانەی کەرکووك بەندکراوە، جا لە بەندیخانەدا ئەم شیعرەی داناوە.

## دۆستی دوژمن و

دۆستی دوژمن و دوژمنی دۆستین هەموو
عالەمیٚ هۆشیارەوە بوو تازە سەرمەستین هەموو
خاسو عامی ئێمەتی چینی ئەوی تریان ئەکا
چاکیشە ماوینەوە هەرچەندە جارستین هەموو
بارەکەڵلا بۆ کەسانیٚ گیانی مەعنایان کڕی
قەیدی عیلمی بیٚ عەمەل بوو وا لە پێی خستین هەموو
گەر لە مێشکی ئەم وشەی ئێمە کەسیٚ بیریٚ بکا
ئێمە جادوو لێکراوی فێڵی چاو بەستین هەموو
خۆشی خۆشیمانە ڕۆحانی و زانامان زۆر هەیە
یانی ئێمە ئەهلی بیرو عیلم و زانستین هەموو
یا چلەکێشیٚ لە خەڵوەی بیری پارە بێتە دەر
ئێمە بۆ خزمەت جەنابی وا کەمەر بەستین هەموو
جوولەکەش هەتا بە زاری خۆی لە ڕازی خۆی دوا
ئافەرین بۆ کوردی ئێمە چاپووک و چوستین هەموو
خۆشەوە بوونی بڕینی یەکیەتی داوا ئەکەین
تازە دەرمانی هەیە حەیفە وەفا سستین هەموو
غەیبەتیش تاعوونە وا ئەم نیشتیمانەی گرتووە
مایەیی بیٚ شەرتییە لەم درمە نەخلەستێین[1] هەموو
تا وەکو دووپشکی (عەربەت)[2] بەن بە پێی یەکترەوە
واتە نەبیرەیدا کە ئێمە دوژمنی دۆستین هەموو
تا لەسەر خۆ سەربەخۆیی بۆ ئەتۆ پەیدا ئەبیٚ
خوێنو ئاو تێکەڵ ئەبیٚ خۆ چونکە مارگەستین[3] هەموو
(نەوحی) قانوونی ئەساسی یەکیەتی وا دا ئەنیٚ
پاکی هەوجاڕی[4] وەفا جووتی وتەی بەستین هەموو

---

١- نەخلەستێین: هەڵنەخلستێین، هەڵنەخلستان، نەکەوتن.
٢- عەربەت: ناحیەیەکە نزیك بە شاری سلێمانی بە دووپشکی کوشندە بەناوبانگە.
٣- مارگەست: مارانگاز، ئەوەی مار پێوەی دابێ.
٤- هەوجاڕ: ئامرازی جووتکردنی جاران.

## ڕەنگی زەرد و باری لێوە

ڕەنگی زەرد و باری لێوە ماڵی کوردی غوربەتە
هەر سبەینێ هەڵدەستێ نیشتیمانەکەی پڕ نەگبەتە
گەر لەسەر تەختی سولەیمانە[1] بەداخە بۆ وەتەن
ناوی یاری سەربەخۆ چاتر لە باغی جەننەتە
با گوڵان و باغی گوڵ بێ ئەو گەلاڕێزانییە
چونکە بێ یار و دیارە کوردە لای ئەو زەحمەتە
گەر نەبێ ڕوخسار و زوڵفی لوول و لێوی ئاڵی ئەو
نازەنینی بێ وەفا، من چی دەکەم لەم غوربەتە
من لە بۆ ئازاری زستان ئاگری ڕووتم هەیە
راجیعە عەقڵم بە ویژدانی نە یاری سەفسەتە[2]
بولبولی دڵ بۆ بەیانی دێتە باغی نیشتیمان
سەربەخۆ خونچە لە کوردا بۆ نەپشکووت حیکمەتە
چیمەن و گوڵباغ و شەستپەڕ بۆ کەسێ چاکە دڵی
ئاسوودەی داخە نە وەك (نەوحی) نەماوی غوربەتە

---

١– سولەیمان: کوڕی داودە، مەلیکی هەرە بە تواناو شانوشکۆی نەوەی ئیسرائیلە. لە سەدەی دەیەمی پێش زاییندا، پێغەمبەر بووە. قسە وەهایە کە خوا بای خستووەتە ژێر فەرمانی ئەوەوە. زمانی هەموو ئاژەڵ و باڵندەیەکی زانیوە. سامانێکی بێژمارەی هەبووە. ئەنگوستیلەیەکی هەبووە (ئیسمی ئەعزەم)ی لەسەر نەقش کراوە و بە هۆی ئەوەوە ئادەمیزاد و پەریی و فریشتە و ئاژەڵ و باڵندە و هەموو گیاندارێك لەژێر فەرمانی ئەودا بوون. کە هەواڵی بەلقیسی قەرالیجەی سەبای بیست، بڕیاری جەنگی لەگەڵدا و بەلقیس ویستی سلێمان ببینێ بۆ ئەوەی لە لایەك جادووەکانی خۆی بۆ بنوێنێ و لە لایەکی ترەوە حیکمەتی سلێمان وەربگرێ، بەڵام سلێمان فەرمانی بۆ با دەرکرد کە بەلقیسی بۆ بێنێ بە تەخت و تاراجییەوە. کە بەلقیس گەیشتە بەردەرگای سلێمان، شووی پێ کرد.

٢– سەفسەتە: ئەوەی خەڵکی چەواشە دەکات و ڕاستی و هەقیقەت دەشارێتەوە.

## چ دەردێکە لە کوردانا

چ دەردێکە لە کوردانا گرانە
غەریبێکی هونەرمەندو بزانە
چییە زامی هەمیشە هەر بە سۆیە
غەریبی دوور لە مەڵبەندو کەسانە
ئەگەر شمشێری هەور بێنیتە خوارێ
ئەڵێن لابە غەریبی کەس نەزانە
چییە چارەی کەسێ تا ئەو بناسێ
بخوێنێ بێتە ڕیزی ئەو بزانە
بە نووسین و بە پۆشین تێ بکۆشین
بژێوی یەکتری بین جا بزانە
غەریب کێیە لە دنیا غەیری کوردان
بە خۆ هەڵنان و لاف[1] ئەجنەبییانە[2]
لە سەد یەك تێدەگا ئینجا لە سەد کەم
تەماشای ئەو یەکە ئەکرێ بزانە
لە باپیرمانەوە بۆمان بە جێما
کە سەرکزبین و مل شۆڕی زەمانە
هیوامە ڕۆژی (نەوحی) وەختە هەڵبێ
سەرم شاباشی ڕێگەی شاهییانە

---

١- لاف: خۆهەڵکێشان، فیشاڵ، درۆ.
٢- ئەجنەبی: بێگانە، دەرەکی.

# برینی دڵ

برینی دڵ کە باویشکێکی داوە
غەم و زوخاوی دووری لێ تکاوە
لە بەر تیری مژەو پەیوەستی ئەبرۆ
گرەی دڵخۆشی هەرچی هەبوو کراوە
نیشانەی غەم هەیە بۆ پیاوی زانا
لە چاوی سوورو ڕەنگی کارەباوە
فەلەك زوو دوژمنی خێوی هونەر بوو
بە هەڵ سووڕاندنی ئەیخاتە لاوە
لەبۆ سووتانە عەشقی پێ گەیشتوو
پەپوولە گەر بچێتە لای چراوە
لە پێ کەوتوو نیشانەی پوختەیی بوو
کە میوە کەوتە بن داری تەواوە
دڵم وێنەی سەعاتی هەفتە کۆکە
وەلامی دووری یاری پێدراوە
لە کاتێ تەپڵی ئازادی ئەکوترێ
لە مەیدانا سەری گەر بێتە دواوە
هەموو لا نیشتیمانی کوردە بۆیە
لە غوربەت (نەوحی) وا ماوە بە پاوە

## دایکم بە کوردی مارە کراوە

دایکم بە کوردی مارە کراوە
بە هەڵپەرکێی کورد شایی کراوە
لەو کاتەی کەوا منی هێناوە
بە چەقۆی کوردی ناوکم بڕاوە
لە بێشکەی کورد کە ڕاژەنراوم
لایەلایەی کورد بۆ من کراوە
لە قوتابخانە کاتێ کە ئەمخوێن
پیت کوردییە پێم نیشاندراوە
لە مێشکم کوردی ڕیشەی داکوتا
تازە کار لە کار وا ترازاوە
بۆت نابم بە تورك یاخو بە عەرەب
هەرچەندە مافو بەشم خوراوە
کورد سی ملوێنە چوار هەزار ساڵە
بە حوکمی بۆگەن بەشبەش کراوە
ئێستاکی گامێشلەوانێ وشکی
ئەڵێ کورد لەچی دروست کراوە؟
ئەمەش ناچێتە هەمانەی[1] ئەوان
قومی تیا نەماوە وا هەڵدڕاوە
نازانێ کاتی دیموکراتییە
لەلای کۆمەڵەو، لای پارتی[2] ناوە
بە بۆنی گوڵو هاژەی ئاوی سارد
بێچوە کوردانی سەرخۆش کراوە
لە خاکی کوردا هەر بە سروشتی
کاتێ گەوهەری تێدا بینراوە
لە خاکی کوردی نەوتی عەبادان
کەرکوکو باکۆ وا هەڵقوڵاوە

---

١- هەمانە: هەنبانە، هەمبانە: ژنان بۆ پاراستنی ساوەر و خوێ و وردەواڵە لە پێستی مەڕ و کاوڕ و بەران دروستی دەکەن.
٢- پارتی: مەبەست لە پارتی دیموکراتی کوردستانە.

## بە یادی نیشتیمان

بە یادی نیشتیمانە بەردەمی دیدەم لەچی ماوە
لەبەر پێی هەر وەتەن خواهە[1] سەرو ماڵم بە جێماوە
غەریبو بێکەسو تەنیا خراومە گۆشەیی ئازار
بە بۆنەی رووی مەرازی وا دەکەی ژینم کە جێماوە
خەیاڵم رێك ئەخەم گوایێ گەلو کۆمەڵ بەجێ بێنم
ئەڵێم راستی کەوە باری وەتەن هێشتا کە جێماوە
ئەدیبانە وەرە مەیدانی هۆزی موشتەری هۆنراو
ئەوانە مێشکیان توندە هەموو بیری لە جێماوە
کە مردیت دێنە پرسەت ماڵەکەت دابەش ئەکەن پاکی
ئەڵێن گا پیرەو هۆڕێکو کەرو کورتانی جێماوە
شوکر میراتی من ماڵی هەموو گۆرانو کوردێکە
گەداو پاشا وەکو یەك بەش بەری زیوێکە جێماوە
دەمێکە چاوەڕوانی چاوەڕاوی تۆیەتی (نەوحی)
وەکی تر خۆی هەلی دەس کەوتو رۆیی شیعری جێماوە

---

١- وەتەن خواه: وەتەنپەروەر.

## ژیانی ئەمن و کورد

ژیانی ئەمنو کوردی بۆچی ماوە؟
لە سەد لا تیری میحنەت لێدراوە
سەلاحەددینو[1] دونیا یانی بەختم
بە ئەیووبی ئەما سەبرم بڕاوە
وەزیفە خۆری عیللەت[2] هێنەرم بوو
پزیشکی کوردە تورکە فارسی ناوە
دەمەرقۆپانو[3] کەوای کوردی ئەگۆڕێ
لەمەولا باسی چاکت بۆ کڵاوە
هەموو بێگانە خاوەن ماڵو جێگەن
منی دەیمی نەبێ کوردم بەراوە
هەزارو سێسەدو پەنجایە ئەمڕۆ[4]
لە بەر چاوم خەیاڵیشت نەماوە
کە فیلی کورد دۆخی[5] لای شاهی تۆ بێ
بە پیادە ئەیترێنجێنینە لاوە
لە سەندووقی پیاوی هەڵبژێراو
بە تەخمین یانزە ملیۆنی تەواوە
نە یارم کوردو غەیری کوردە دیسان
کە یارم بێ تەمیزو مەستە چاوە
لە کاتێ دڵ ئەبا بۆ خزمەتی خۆی
بناخەی تیری غەمزە و تیلی[6] چاوە
هیوامانە بچینە سایەبازی[7]
هەتاویشی دایە ئەو سێبەر نەماوە

---

١- سەلاحەددین کوڕی یووسف کوڕی نەجمەددین شادیبە، لە ساڵی (٥٣٢ ك-١١٣٨ز) لە قەڵای تکریت لە دایك و باوکێکی کورد لە دایك بووە. سەرکردەیەکی ناسراوە، زۆر ئازا و بە جەرگ بووە، بە سەلاحەددینی ئەیووبی ناسرلوە، کاتی خۆی قودسی لە چنگ سەلیبییەکان ڕزگار کردووە. ٢- عیللەت: دەرد، نەخۆشی.

٣- دەمەرقۆپان: پانتۆڵی فاسۆن. فاسۆن: پارچەی ئەستووری کەوا و پانتۆڵ.

٤- واتە: ئەم شیعرە لە ساڵی (١٣٥٠ك) بەرامبەر بە ساڵی (١٩٣١ز) نووسراوە.

٥- دۆخ: چلۆنەتی، بار. ٦- تیل: ئاماڵ خوار.

٧- سایەبازی: سایە: سێبەر. سایە بازی: مەبەست لەوەیە کە بچنە سێبەرێك و تاوێ دانیشن و هەندێ یاری بکەن، وەك یاری سێ ڕسکان و پێنج ڕسکان و دامە و...

نزیکە سەربەخۆیی بۆ گەلی کورد
بەلاّم کاتێ ئەبێ (نەوحی) نەماوە[١]

## ستەم نەمێنێ[٢]

ستەم نەمێنێ بڕوخێ تەواو
دێمەکارەکان گشت ببنە بەراو
ئەوەی مەڵبەندو خاکم دەفرۆشێ
سەری جودا بێ، بە دارا کراو
ستەمخانەکان گشت ببێ وێران
ستەم پیشەکان لە شار دەرکراو
نەزان ئەوەیە شیروایی ئەخوا
کچیش وەك کالاّ[٣] ئەدا بە دراو

---

١– واتە: نزیکە کورد سەرفرازیی و سەربەخۆیی بەدەست بهێنێت، بەلاّم ئەمە کاتێك دەبێت کە نەوحی لە ژیاندا نەماوە.
٢– نەوحی ئەم هەڵبەستەی بە جۆرێکی تریش داڕێژاوە، بەلاّم ئێمە ئەمەیانمان بەلاوە پەسەند و جوانتر بوو، بۆیە ئەوەی ترمان فەرامۆش کرد.
٣– کالاّ: شتومەك بۆ فرۆشتن. شاعیر لە شیعرەکەیدا بە توندی دژ بە ستەمکار و ئەوانە وەستاوەتەوە کە پشت لە نیشتیمان و خاکی خۆیان دەکەن و بە بێگانە دەیفرۆشن. ئەو باوك و دایکانەش مەحکووم دەکات کە لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان، کاتێ کچەکانیان بە مێرد دەدەن، پارە و سامانێکی زۆر لە زاوا وەردەگرن و بۆ خۆیانیش دەیخۆن. ئەمە لەو ڕۆژگارەدا وا بووە، بە تایبەتی لە گوند و لادێکاندا...

## ڕووخا ئەو کاتەی

ڕووخا ئەو کاتەی کە نوری[1] پیاوە
لە چواردەی تەمووز بە ژن بینراوە[2]
نوری پەرستو یاسای ماکەری
بۆ کاتەکەی زوو لە چاوەڕاوە
کوا عەبدولئیلا[3] ئەڵێن ڕەسەنە؟
بەچکە مووچەخۆر نانە خوساوە
کاتی مەلەکیو چەرچیەتی نەما
ئەوەی بە دۆلار هەڵخەڵەتاوە
ئێستاکە ڕۆژی گەلو سەربازە
ڕۆژی لاوێکی بەش نەخوراوە
ڕۆژی ئەوەیە وە دەستو پەنجەی
ئیمزای کەلەبچەی پێوە نراوە
ڕۆژی گەلێکە کەوا لەمەو پێش
پێی بە زنجیری ستەم کراوە
دەرگای ئازادی وا کرایەوە
دەرچوون ئەوانەی دوێنێ گیراوە
هەرکەس هەژاری خۆی نەلاوێنێ
چۆن ئەڵێن کابرا بە خودا پیاوە
خورماو نەوتو پەس ناڕوا بۆ (ئیدن)[4]
بەو یاسا پیسە دوێنێکە باوە
یاسای گەلیەتی ماتم ئەداتێ
شیری یەکیەتی وا تازە ساوە
عەرەبو کوردو کۆمەڵەکانی

---

١- نوری: نوری سەعید.

٢- بەژن بینراوە: لە پاش شۆڕشی (١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨) نوری سەعید ویستی بە بەرگی ژنانەوە خۆی لە چنگی شۆڕشگێڕان ڕزگار بکات، بەڵام سوودی نەبوو؛ بەو بەرگەوە گرتیان و لە ئەنجامدا گوللە بارانیان کرد.

٣- عەبدولئیللا: کوڕی مەلیك عەلی کوڕی حوسێنە، لە ساڵی (١٩١٣ن) لەدایك بووە و بە (الوصي عبدالاله) ناسراوە. خاڵۆی مەلیك فەیسەڵی دووەمە، لەبەر ئەوەی مەلیك فەیسەڵ منداڵ بووە، ئەم کاروباری دەوڵەتی بەڕێوە بردووە و سەرپەرشتی مەلیکی کردووە. لە ساڵی (١٩٥٨ن) لەگەڵ بنەماڵەی مەلیکدا کوژرا.

٤- ئیدن (ئەنتۆی ئیدن): وەزیری دەرەوەی بریتانیا بووە.

بە ماتی خۆشی بەشی دراوە
هەر لاوی کوردە لە هەموو لایی
هەڵیدا بەیداخ بە وێنەی کاوە
تێپەڕی یاسای مەلەکی چڵکن
با بمرێ خوێنمژ ئەوەی کە ماوە
دالاس و[1] ئیدن شەمعوون و[2] حوسێن[3]
هەر وەکو دیگۆل[4] پەتی بڕاوە
لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە
بە ئاشتی و سەلام سەر لە پێناوە
بژی ئازادی و گەلی عێراقی
بمرێ ئەوانەی هەڵخەڵەتاوە

١– دالاس: ماوەیەك وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بووە.
٢– شەمعوون: مار شەمعوون.
٣– حوسێن: مەلیك حوسێن کوڕی مەلیك عەبدوڵلای ئەردەنە.
٤– دیگۆل: شارل دیغۆل، لە جەنگی جیهانی دووەمدا جەنراڵێکی سەربازی بووە و دژ بە هیتلەر ڕاوەستاوە و دواتر بووە بە سەرۆکی کۆماری فەرەنسا.

## ڕاسته جه‌مهووری

ڕاسته جه‌مهووری، عه‌ره‌بو کورده
خۆ تورکو فارسیش له‌ ئێمه گرده
ئێمه بۆ ئاشتی براده‌ریانین
گه‌ر درۆ نه‌که‌ن له‌م کاته ورده
ئازادی ئێمه وه‌ نییه‌ وا بێ
ئێمه ده‌ست به‌رده‌ین له‌وه‌ی که‌ مه‌رده
هه‌رچی میلله‌تی عێراقی هه‌یه
بۆ نیشتیمانی هه‌موو هاوده‌رده
با ژه‌نگ هه‌ڵئه‌نێن براده‌رمانن
خۆ به‌ زۆر نابێ ئه‌مه خوو کرده
ئێمه کوژراوین، ئێمه خنکاوین
بۆیه جه‌مهووری عه‌ره‌ب و کورده
به‌بێ سه‌رمایه کێ قازانج ئه‌کا؟
خۆ ئه‌مه دیاره نه‌ك له‌ ژێر په‌رده
ئه‌ی براده‌ری تورکمانه‌کانمان
ئه‌ی ئه‌رمه‌نی‌و فارس به‌بێ ڕه‌نج به‌رده
هاوڕێی قازانج سه‌ربه‌ستیمانن
ئێوه‌مان ئه‌وێ لێتان بێ موژده
کاکه‌ مسته‌فا[1] و کاك عه‌بدولکه‌ریم[2]
بژین به‌ جووته‌ هه‌ردوو سه‌رکرده
کوردو عه‌ره‌ب و فارس و ئه‌رمه‌نی
بۆ ناو خۆی عێراق هه‌موو به‌ گورده

---

١– کاکه‌ مسته‌فا: مه‌به‌ست خوالێخۆشبوو مه‌لا مسته‌فای بارزانییه.

٢– عه‌بدولکه‌ریم: عه‌بدولکه‌ریم کوڕی قاسم کوڕی محه‌ممه‌د کوڕی به‌کر زوبێدییه، دایکیشی له‌ هۆزی تمیمی عه‌دنانییه، له‌ ساڵی (١٩١٤ز) له‌ گه‌ڕه‌کی قه‌نبه‌ر عه‌لی له‌ به‌غدا له‌دایك بووه. له‌ (١٩٥٨/٧/١٤ز) شۆڕشی به‌رپا کردووه‌ و ڕژێمی پاشایه‌تی ڕووخاندووه‌ و بووه‌ به‌ سه‌رۆك کۆماری ئێراق. له‌ ڕۆژی (٨ی شوباتی ١٩٦٣ز)دا له‌ کوده‌تایه‌کی خوێنڕێژدا، له‌لایه‌ن به‌عسییه‌کانه‌وه‌ کوژراوه.

## کوردێ کورد نەبێ

کوردێ کورد نەبێ خۆی فرۆشتووە
خۆ خۆرەو ئێسکی خۆی کرۆژتووە
ئەی تۆ نابینی خەنجەری کوردی
وا لە دینارا[1] ڕزگاری کردی
تۆ لە کوردییەت هەڵمەتۆرێنە[2]
ناوو نیشانی خۆت مەدۆڕێنە
بە زمان کوردو بە دڵ کورد نەبی
لە کاتی دوایی گەردن ورد ئەبی
ئەو کەسەی کوردە کە کورد بژێنێ
ئاین‌و ژینی پێبگەیەنێ
نەوەك هەر بژێ بەزگەڕۆیی[3]
کاتێکی زانی ئاینی ڕۆیی
ئەمە یاسایە برای بە دەورە
بۆ کوردستانی بچووك‌و گەورە[4]
کورد لە عێراق حوکمی خۆی ئەکا
لاساری نەبێ خۆی ئۆخەی ئەکا
تۆ دڕکی گوڵ بە بۆنی گوڵ بکە
تۆ گوڵبڕ مەبە لە خۆت سڵ بکە
(حەموراب)[5] کوژرا بە دیموکراتی
مێژوو شاهیدی چۆنیەتی‌و کاتی
چوار هەزارو دووسەدو چل و شەش
ساڵە تۆ کوردی کراوی بەشبەش

---

١- دینار: شاعیر ئاماژە بەو خەنجەرە دەکات کە لە پاش شۆڕشی (١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ز) وەك ڕەمزی کورد لە ڕووی پارەوپوولەکاندا وێنەی کێشرا.

٢- تۆڕلندن: ڕەواندنەوە.

٣- زگەڕۆیی: سکەڕۆیی، زۆرخۆر.

٤- گەورە: کوردستانی گەورە، شاعیری نیشتیمانپەروەر لەو ڕۆژگارەدا بۆ هەر چوار پارچەکانی کوردستان خەمی خواردووە و بیری لەوەش کردووەتەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبن بەیەك و کوردستانی گەورە پێك دەهێنن.

٥- حەموراب: حەمورابی (١٧٩٢-١٧٥٠پ.ز) مەزنترین پاتشای ئیمپراتۆریەتی بابلی بووە، خاوەنی پێشینەترین دەستوور و یاسایە لە جیهاندا.

ئێستاکە کاتی خۆ ڕێکخستنە
بۆ کوردەواری کەمەر بەستنە
برا هانایە خۆت گردەوە کە
لە ناو گەلاندا چاو وردەوە کە
هەر کوردە جێماو بەشبەش کراوە
بە دەستی دوژمن مافی خوراوە
ئەمە زۆر نەنگە نەتۆ تێنەگەی
لە پێشو بەری خۆیشت پێنەگەی
نەوتی عابەدان[1]، کەرکووک و باکۆ[2]
چۆن هەڵئەقوڵێو بۆ کێ ئەبێ کۆ
هیوامە ئیتر پیادە بەس بڕۆی
نەک سواری هەواو بە هەوەس بڕۆی

---

١- عابەدان: عەبادان، شارێکە لە ئێران لە بواری نەوتدا دەوڵەمەندە.
٢- باکۆ: شارێکە لە ڕوسیا، پایتەختی ئازەربایجانە.

## ئەوا جوو تێگەیشتو کەوتە سەرپێ

ئەوا جوو تێگەیشتو کەوتە سەر پێ تۆ نەبی کوردە
هەتاکەی وای لە چۆڵی جەهلدا، ئەم هەردەو، هەردە؟
ئەوەی زانایە دوعا نووسە[1] هیوای جەلبی ئەرواحە[2]
ئیتر بەسیە ئەم پەستییە هەتاکەی مۆری بێنەردە[3]؟
کەسێ زانایە هاوخوێنی نەزانی پێی بزانێنێ
بە ملوێن کوێر بە چاو ساغی ئەبێ ڕاهی[4] لەبۆ هەردە
ئەوەی خۆی پیاوی خوا دانا لەبۆ ئاسوودە ژینی بوو
ئەڵێ من سەرپزیشکم دیدەنیم چارەی هەموو دەردە
ئەمە درمێکە یەکسەر کوردی داگرتووە لە هەر لایێ
بەبێ پیشەو نەزانستن ئەڵێ من بم بە سەرکردە
کەسێ بیخوا تۆ بیپۆشێ هەزاری خۆی کە دادۆشێ
لە ژینی خۆی کە تێکۆشێ بڵێ ئەو پیاوە کەی مەردە؟
لەبۆ کاروانی ڕێگەی دوور گەر کەرەکەی بە پێشەنگی
لە قوڕدا داچەقێ تازە بڵێ چش[5] دەستی لێ بەردە
تەماشای خۆرنشین کە خۆرهەلاتی عیلمو زانینە
لە شوومی کوردی بێچارە ئەڵێ وادە و ڕێگەی بەردە
زەوی پێوا هەوای کێشا پەل ئاوێژێ[6] لەبۆ کەیوان[7]
بە زانستینە ئەی کوردە ئەوەکو شەیتانی و جەردە
عەقڵ ڕۆیی لە دەستی تۆ خوا بیدا بە منداڵت[8]
ئەوەی ئازادە ئازایە بخوێنێ پڕ دەست و بردە
وەکو (ئەوحی) لە دێدا دامەنیشە دەستەو ئەژنۆ
بڕا جەرگی زڕا ناوی کە چونکە پێی ئەڵێن کوردە

---

١- دوعانووس: ئاماژە و سەرزەنشتە بۆ ئەو زانا ئایینییانەی کە هەمیشە خەریکی نوشتە نووسین بوون و بیریان بە لای نەتەوە و نیشتیمانپەروەریدا نەچووە.
٢- جەلبی ئەرواح: جۆرە نوشتەیەکی خۆشەویستییە.
٣- نەرد: تاوڵی، تاوڵە.
٤- ڕاهی: ڕێڕەو، ئەوەی بە ڕێگادا دەڕوات.
٥- چش: هیچ، نە هیچ شت.
٦- ئاوێژ: وەك پاشگرێك بە مانای فڕێدەر یان هاوێژەر دێت.
٧- کەیوان: ئەستێرەیەکی گەڕۆکە.
٨- ئاماژەیە بەم پەندە (خۆت لە دەست چوویت، خوا عەقڵ بە منالّت بدات).

## پێشمەرگە پشکۆی

پێـــشمەرگە پـــشکۆی ئـــاگری کـــوردە
بـــۆ دوژمـــن ســـووتێن بـــە دەســـتو بـــردە
چـــونکە لـــە جەرگـــەی کـــورد هـــەڵقولاوە
ئـــــەوەی ناباشـــــە ئەیخاتـــــە لاوە
کـــێ ئـــەڵێ پـــارتی دوو کـــەرت کـــراوە؟
یـــەکێکی دەیمـــەو یـــەکێی بـــەراوە
پـــارت دوو جیهـــازی هەیـــە لـــەم ئیـــشە
یـــەکێی تـــەنزیمات یـــەکێی شۆڕشـــە
یەکـــەم هـــۆ ئیـــشەو زنجـــیرەی ئەنـــدام
دووهـــەم پێـــشمەرگە لـــەبۆ ســـەرەنجام
هـــــەر گـــــوڵێ لـــــە بـــــن داری ڕواوە
خـــــوێنی پێـــــشمەرگەی پێـــــدا ڕژاوە
دارو کـــەژو کێـــو کـــە شـــین کـــراوە
بـــە خـــوێنی لاوی کـــورد ئـــاودراوە
ژنو پیـــاوو پـــیر گـــەنجو خوێنـــدەوار
هـــەموو هـــاو وتـــەن هـــەموو هـــاوکردار
ئەنـــدامی هـــەردوو جیهـــازی ڕوونـــە
مـــیری ئەناســـێ هەڵوێـــستی چـــۆنە
جـــارێ هەڕەشـــە یـــا پاڕانـــەوە
جـــارێ گلـــەیی بـــۆ گەڕانـــەوە
جـــارێ تەشـــەبوس بـــە میـــسر ئـــەکا
یـــا ســـواری بـــە جـــاش لـــە هێـــسر ئـــەکا
ئەمـــە هەڵوێـــستی مـــیری دژمانـــا
بـــە کـــام ڕووەوە دێ بـــە گـــژمانا
ئێمـــە ســـڵ ناکـــەین لـــە تـــۆپ و لـــە غـــاز
بـــە هـــۆنراوەیی ئەگەینـــە هـــەوراز
کوردەکـــان ئێـــستە تێگەیـــشتوون
لـــە ســـەد نـــەوەتی پێگەیـــشتوون

یەکێ لەو سەدە با هەر ناباش بێ
هەتاکو ئەمرێ ئەبێ هەر جاش بێ
بە وتەی (نەوحی) دڵت با نەرم بێ
خاکی کوردستان تاجی سەرم بێ

## ئەیلوولە ڕۆژی ڕەشی مێژووە[1]

ئەیلوولە ڕۆژی ڕەشی مێژووە
ئەیلوولە ڕۆژی گەشی هێناوە[2]
ئەیلوولە جەژنی دووهەمی کوردە
سروە وەڵامی خۆشی هێناوە
ئەیلوولە پیرۆز لەبۆ کوردستان
(بارزانی) بەسەر بەشی هێناوە
هەورەکەی نەگبەت بە خەباتی کورد
وا ڕەوایەوەو گەشی هێناوە
موستەفای بارزان بەری ئامانجە
وا میر حاج[3] و هی کەشی هێناوە
ئەسعەد خۆشەویست کوردەوارییە
کوردەوارییە وانی هێناوە
(نەوحی) بژێوی کوردیمان کێیە؟
مامۆستای بارزان مستەفای ناوە

---

١– ئاماژەیە بۆ ڕاپەڕینە مێژوویییەکەی ١٩٣٠/٩/٦ کە لە شاری سلێمانیدا بۆ بەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی کورد، دژ بە ڕژێمی پاشایەتی ئەنجامدرا و بە شەهیدبوونی چەند هاوڵاتییەك کۆتایی پێهات. ئەو ڕۆژە بەلای کوردەوە، بە ڕۆژێکی ڕەش ناسراوە.

٢– ئاماژەیە بۆ شۆڕشی ئەیلوول.

٣– میر حاج: ئەم زاتە بە (میر حاج ئەحمەدی) ناسراوە، لەگەڵ (ئەسعەد) کە لە دێڕی دواتردا ناوی دێت، هەردووکیان لە سولرچاکی لەشکرەکەی پێشەوا قازی محەممەدی نەمر بوون، کە لە پاش ڕووخانی ئەو کۆمارە (١٩٤٧ز)، لەگەڵ بارزانی ڕۆیشتوونەتە ڕوسیا و لە ساڵی (١٩٥٨ز)یشدا گەڕاونەتەوە کوردستان.

## گەورەی پاڵەوانە

گەورەی پاڵەوانە فڕۆك هەڵفڕە
گژەی باڵی کۆلارە یا کورکورە[1]
کەوا هاژە هاژی گوللەی مەترەلۆز[2]
لە سەردا لە ژێردا کەوا تێپەڕە
تەپوتۆزی ڕێی لەشکری هەردولا
کەوا تێڕژاون ئەڵێی مەحشەرە
سەرو ژوور و ژێر بوو بە ئاگر پەڕین
کتوپڕ وەلام هاتەوە ئەم بەرە
لە ئەملا لە گوردانی[3] گوردان بڕی
تفەنگی لە مل دەستی پڕ خەنجەرە
لە تیرەو نەبیرەی هەموو عەشرەتی
لە مەیدانی دوژمن کەوا حازرە
لە وەختێ کە بەمبۆی[4] ئەهاویشتە خوار
ئەڵێی جەژنی قوربانە بۆ شەهپەڕە[5]
بە غەم فێرە ئەدوا ئەو لە مێژوویدا
لە مانگی حەجا بیستو نۆ تێپەڕە
خۆیان و تەپو تۆزی هەردوو تەرەف
کەوا تێڕژاون ئەڵێی مەحشەرە
لەسەربانی خانوو لە پاڵی کەنوو[6]
لە هەر لایەوە سەیر ئەکەی هەر شەڕە
بە کتوپڕ لە گوردانی کوردانمان
ڕکێف کوت[7] خۆیان خستە ئەو سەنگەرە

---

١- کوڕ کوڕ: قەتێ، جۆرە باڵندەیەکی کێویە.
٢- مەترەلۆز: ڕەشاش، شەستتیر، جۆرە چەکێکی جارانە.
٣- گوردان: کۆی (گورد)ە، چاونەترس، ئازا.
٤- بەمبۆ: بەمبە، گوللەی تۆپی جەنگی.
٥- شەهپەڕ: شاپەڕ، شاباڵی پەلەوەر، گەیشتنی پەلەوەرە کۆچەرییەکان.
٦- کەنوو: کەندوو، جاران ژنان لە گوند و لادێکاندا لە قوڕ ئامادەیان دەکرد، ساوەر یان ئاردیان تێدا دەپاراست.
٧- ڕکێف کوت: تاودانی ئەسپ لە لایەن سوارەوە.

ئەوەندەی ئەما بوو ئەوان دیل بن
ئەمان بوونە لەنگەر لە ئەو سەنگەرە
لە (نەوحی) ئەپرسیٚو ئەلٚیٚ پیٚت کەوا
(شەطی غەم)[1] لە میٚژوویدا نووسەرە

## عەرەب ماڵی ئاوا

عەرەب ماڵی ئاوا لە چەن جیٚگەوە
مەلیکی هەیەو هاو وتەن پیٚکەوە
هەموویان موسڵمان و هاو ئاینن
لە ئامانجی ئیٚمەش وەرە تیٚگەوە
ئەگەر ئیٚمە ئارین لە سامی ئەتۆ
لە ئاین هەوێنی هەیە پیٚکەوە
تەمیزیٚ بخە بەینی مەڵبەندمان
لە ئیٚمە و لە تورك و لە فارس پیٚکەوە
چ خۆشە کە ئیٚمە بە تەنیا بژێین[2]
لە سەر بەستی ئیٚوەش ببین پیٚکەوە
سوێنت ئەدەم بەو هەوێنەی خوا
کە ئیٚمەو ئەوانی لکان پیٚکەوە
نەڵیٚی (نەوحی) بۆ خۆی کە خوونکی[3] ئەکا
هیوامە مەبەس ژوور کەویٚ تیٚکەوە

---

١- شەطی غەم (شطی غم): بە گوێرەی پیتەکانی ئەبجەدی، دەکاتە (١٣٤٩ك)، واتە لەم ساڵەدا ئەم هەڵبەستەی نووسیوە، ڕاڤەکەیشی بەم جۆرە دەبێت: ش=٣٠٠ + ط= ٩ + غ= ١٠٠٠ + م= ٤٠ کە هەمووی دەکاتە (١٣٤٩ك). جگە لە ئەم لێکدانەوەیە، شاعیر خۆیشی ساڵەکەی دیاری کردووە.

٢- شاعیر لێرەدا ڕووی دەمی دەکاتە عەرەب و تورك و فارس و داوای سەربەخۆیی و ئازادی بۆ نەتەوەکەی دەکات.

٣- خوونك: هەرزەکاری، نەزانی.

## قۆپی قەرەداغ[1]

کوردستان خاکی هەر وەك گەوهەرە
ئاوی شیرینە دەڵێی کەوسەرە
کززەی شنەبای سەر لە بەیانی
ژیان ئەبەخشێ بە دانیشتوانی
لە قاسپەی کەوی دەمەو بەیانی
کە ئەچرکێنێ بۆ ئازیزانی
شارو دێهاتی لێیان گوێ دەگرێ
لە پێکەوتوان هەموو پێدەگرێ
دیمەنی قۆپی ئەخەمە بەر چاو
نموونەیەکە لە هەزار بەراو
حەوت کیلۆ مەتر درێژیو پانی
رازاوەی سروشت دەستی یەزدانی
بە دارو بە گوڵ ئاوی ساردو خۆش
رێبوار بە رێدا مەست ئەبێ سەرخۆش
چونکە چوار دەوری شاخەکەی بەرزە
خۆی نیشان ئەدا بە هەزار تەرزە
ژمارەی داری چەند ملوێنێکە
هەر دەربەندێکی بەتالوێنێکە
لە چاشتەنگاوا هەتاوی هەڵدێ
گەییە نیوەڕۆ سێبەری لێدێ
نەخۆش بە هەوا چاك ئەکاتەوە
ژەنگ لە دەروونی پاك ئەکاتەوە
لە چڵەی تەمووز ئارەقیش ناکەی
ئارەزووی هەوای لوبنانیش ناکەی
سینە دەبانی کوردی بەرێزە
بەهەشتی کوردی شیرین بەرێزە
قەرەداغ بە قۆپی شانازی ئەکا

---

١- ئەم شیعرە بەشێکی زۆری لێ فەوتاوە.

بکـــــوژی دوژمـــــن ســــــەربازی ئـــــەکا
دیمــــــەنی قـــــۆپی هەیـــــەتی مـــــافی
لـــــە ســـــاڵی دووجـــــار بـــــچیە تـــــەوافی
چـــــونکە مەڵبەنـــــدی نیـــــشتیمانێکە
لـــــە کـــــاتی جـــــەنگا پـــــشتیوانێکە

## هێشتا کورد زمان

هێـــشتا کـــورد زمـــان، تێنەگـــەییوە
بـــەو چـــاوەڕاوە پێـــی هـــەڵخزیوە
بـــە بۆنـــەی فارســـیو خـــەتی عـــەرەبی
زمـــانی کـــوردی وا لـــەبیر چـــووە
چـــوار هـــەزارو دوو ســـەدو چـــل ســـاڵە
بـــە بێگانـــەوە خـــۆی هەڵواســـیوە
بـــیر بکـــەرەوە بێنیـــەوە بـــەر چـــاو
تـــۆ چـــیت ئـــەو چـــیيە کێـــی پـــێ بـــەزیوە؟
ئـــەو بـــە جـــلو بـــەرگ بـــە زمـــان و نووســـین
کەوتـــە پـــێش ئـــەتۆ ســـەربەخۆی دیـــوە
گـــەر خـــۆت نەناســـی بـــە زۆڵ ئـــەژمێررێی
لـــەو دیـــوە مـــەڕۆ وەرە ئـــەم دیـــوە
وتـــاری (نـــەوحی) بـــە گـــوێ ڕاگـــرە
بـــا ئـــاڵتوون نـــەبێ خـــۆ وەکـــو زیـــوە

# ژن کە پیر بوو

ژن کە پیر بوو خۆی لەبۆ مردن ئەڕازێنێتەوە
پیاوی پیر، بێ خەو ئەبێ نوستو هەڵئەسێنێتەوە
هەر کەسێ نابووتە قەرزی کۆن و ئاشنای تازەیی
یەك بە یەك دێنێتە بەر چاوو ئەیانبینێتەوە
ئەو ئەدیبە وا وتاری شارەوای کوردانەیە
تێ نەگیوانی وەتەن شەرتە کە بژێنێتەوە
تیرە تیرە بێ جەلەیکە[1] سەرجەلەی[2] لێ دابڕە
شەرتە وا تێکەڵاو ببێ ئەڵماس بتوێنێتەوە
چوار هەزارو دوو سەدو چل ساڵە کوردی نوستووە
هەر بە چاو داگرتنێ تۆڵەی ئەو ئەسێنێتەوە
با بە زنجیری هونەر کوردی هەموو هۆنراوە بێ
شێخ و ئاغا دێ بە فیکە ڕشتە[3] ئەپسێنێتەوە
پیرو گەنجی کوردەواری زۆرە (نەوحی) تۆ وەرە
کلکەنەوتینە، بریني جەرگم ئەکولێنێتەوە

---

١- جەلە: پەیوەندبوون بەیەکەوە.

٢- سەرجەلە: مەبەست لەو کەسەیە کە دەبێتە هۆی بەستن و پەیوەندکردنی تیرە و بنەماڵەکان بەیەکەوە. واتە: نەوحی دەڵێت: تیرە تیرە مەبن، تا دەتوانن یەك بگرن و ڕێزیش لەو کەسانە بگرن کە دەیانەوێت ئێوە بە یەکەوە پەیوەندبکەن، ئەگینا لێکدابڕان و ناکۆکی دەبێتە هۆی ئەوەی دوژمن بە ئاسانی زەفەرتان پێ ببات و بتوێنەوە.

٣- ڕشتە: کشتەك، ڕستە، ڕستەك.

## ئینسانی کورد

ئینسانی کوردی بەڕێز پارتییە[1]
ئاواتەخوازی دیموکراتییە
لە ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوولا
لەو بگرەو بەردەو لەو گەردەلوولا
لە دیهات و شار لە شەعب و جەیشا
لە کوردی زیاتر نەبوو لە ئیشا
کوێرا[2] جیاوازی کەوتە نێو کوردی
چ یاسایەکە لە خشتەی بردی
وەرە بارەگای خەبات بزانە
ئەوەی کە شوانە بە وێنەی خانە
هیچ جیاوازییەك نییە لە ناویان
لە پاتشاو جوتیار هەتا گاوانیان
مێژوو (هەزارو سێسەدو هەشتا)[3]
(نەوحی) بە خزمەت زندووە هێشتا
تاکەی پەستیەتی، ئیتر بەسیەتی؟
هەر کەسێ کوردە کوردی کەسیەتی

---

١- پارتی (پ. د. ك): نەوحی ئەندامێك بووە لەم پارتە سیاسییەدا.
٢- کوێرا: چ نوو.
٣- ساڵی (١٣٨٠ك) بەرامبەر بە (١٩٦٠ن) شاعیر ئەم شیعرەی وتووە.

## بیری کێیه وا

بیری کێیه وا له ڕیزی هۆزی خۆی نا ڕازییه؟
مایەی بێ هۆشییه چاوم به مەرگت وا نییه
تۆ له ویژدانا له ئەم شیعره تەماشا گەر بکەی
سەد وەکو من بێتو تەنویری بکا کافی نییه
کێ به عەقڵی خۆی ئەڵێ سووکه له کێشانەی هونەر
هەر کەسێ ئەدوێنی سەعدی[1] و حافز[2] و خاقانییه[3]
شێخ و قازی و حاجی، سۆف و ئاغا کوێخا بۆ خۆیه
هەر کەسێ هۆزی نەژێنێ ئەو کەسەی ئازا نییه
ئەقڵی کول[4] سەرسامه بۆ ئەم جلوەی مەعریفەته
هاتو تەفزیلی خەلەفیاندا[5] به سەر ئەسلافییه[6]
بۆ بناغەی یەکیەتی زانستی هێزی پایەیه
هەر کەسێ ئەدوێنی بەم هۆشه وەکو یابانییه[7]
بیری من سەرسامه بۆ ئەو تێ نەگەیوانەی کەوا
کوردن هەموو کورد زمانو، دوژمن به کوردانییه
موختەسەر خۆشه مەبەس لەم باسه تەنویره لەبۆ
ئەو کەسانه کورده (نەوحی) کوردی وا لا چا نییه

---

١- سەعدی: شێخ سەعدی شیرازی، یەکێکه له ئەدیبه هەره بەناوبانگەکانی ئیسلام پەروەری ئێران. له ساڵی (١٢٩١ز) کۆچی دوایی کردووه، له ناو خەڵکیدا به شێخ سەعدی ناسراوه.

٢- حافز (حافظ شیرازي): ناوی شەمسەدین محەممەده، یەکێکه له کەڵه شاعیرەکانی ئێران، بەرهەمەکانی شاکارن. له ساڵی (٧٩١ك) له شیراز کۆچی کردووه و هەر لەوێیش سپاردەی خاك کراوه، ئێستا ئەو شوێنه پێی دەڵێن (الحافظیه).

٣- خاقان: ناوی ئەفزەلودین کوڕی عەلی خاقانییه. له نێوان ساڵانی (١١٠٦-١١٩٨ز)دا ژیاوه، له گەورەترین شاعیرانی سەدەی دوانزەمی ئێرانه. یەکێکه له مامۆستایانی غەزەلی فارس، نازناوی (خاقانی)یه.

٤- کول: هەموو، گشت.

٥- خەڵەف: نەوه، نەوەی چاك، کەسێکه له دوای کەسێکی ترەوه دێت، جێنشین.

٦- ئەسلاف: پێشینان.

٧- یابان: وڵاتی یابان. ژاپۆن.

## ئەم سەدەی چواردە

ئەم سەدەی چواردە لە ئێمە ڕۆژی سەرگەردانییە
هۆزی کوردی بیری دانا ڕووی لە مەڵبەندا نییە
یەک بە بیری خۆ ژیانو یەک بە بۆنەی ئاغەیی
کۆمەڵێ دۆستی بسووتێ ئاو بە سەردانی نییە
سەیری ئاشی کارەبا پێویستی یەک دوو ئالەتە
هەر فیروزو دینەمۆیە کە مایەی گڕدانییە
کاتی داماوی هەموو کەس ڕوو لە بابانی ئەکا
بۆ کەس بابانی شێوەی (ئەحمەد)ی[1] بابانییە
زۆر سەرۆکی عەشرەتی وەک حەوتەوانانن[2] هەموو
چەرخەدانی دەوری جەددی[3] پەیڕەوی بابانییە[4]
زیرەکو وریاو ژیرە لەبۆ بژیوی کوردەکان
بۆ گڵۆپی بیری هۆزی شەوچرای بابانییە
جێنشینی میری میرانە لە عەسری هەشتەوە
پشتوانی هۆزی ئێمە ئەحمەدی بابانییە
ئەردەڵانی و موکریانی لەگەڵ سۆرانییان
نازکیشی بیری تیژی ئەحمەدی بابانییە
بۆ وەجاخی میر موراد[5] و میر بەدر[6] و میر بوداغ[7]
جێی نیازو جێی هیوایە تایەفەی بابانییە
وا شەبەق بوو ڕۆژی ئێمە شەو نەما (نەوحی) ئیتر
بۆچی ناڵێی میری میران وا لە ناو بابانییە

---

١- ئەحمەد بابان: ئەحمەد موختار بابان، لە سەردەمی پاشایەتیدا لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی ڕابردوودا چەند جارێک بووەتە وەزیر (وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی، وەزیری داد، وەزیری پەروەردە، جێگری سەرەک ئەنجومەنی وەزیران، سەرەک ئەنجومەنی وەزیران).

٢- حەوتەوانان: حەوبراڵە، حەوبرا، حەوتبرا، حەوت ئەستێرەن لە نزیک یەک.

٣- جەدی: کارژۆڵە، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە لە شێوەی کارژۆڵە، بە عەرەبی (برج الجدی) پێ دەڵێن.

٤- بابانی: مەبەست لە میرنشینی (بابان)ـە.

٥- کوڕی تەیموور خانی ئەردەڵانییە.

٦- کوڕی تەیموور خانی ئەردەڵانییە.

٧- کوڕی تەیموور خانی ئەردەڵانییە.

## کەر لە کەری ناکەوێ

کەر لە کەری ناکەوێ گەر بێت و لە نێو میسرا بێ
خۆڵەمێش چاترە بۆی تاکو لە نێو قەسرا بێ
غیرەتی کوردییەتە میللەتی کوردی کە ئەوێ
خۆشی ئەو وەختەیە بۆی دەرگی سەفای بەسرا بێ
کورد ئەگەر بێت و نەکا کۆمەکی خۆی کەی کوردە
بێشکە زۆڵە ئەو لە نێو بێشکەدا گەر بەسرا بێ
میدیا خۆ کوردە لە مێژێ بووە پێ لەنگی وەتەن
غیرەتی کوردێتی عیللەتی وەك سەفرا بێ
کورد ئەگەر کورد بێ لە کوردێتی خۆی لا نادا
گەر لە نێو میللەتی جودا بێ وە یا تەرسا بێ
هاتو لایدا لە خەتتی حوببی وەتەن زۆڵە ئەوە
شاهیدە (نەوحی) بۆ هەق گەر بێت و بفەرمێ بابێ

## کەس لە شاری خۆی

کەس لە شاری خۆی دوور کەوتوو نەبێ
هیچ کوردێ وەك من کۆس کەوتوو نەبێ
ئەمە چل ساڵە دوورم لە شارم
لە خزمو خێشو لە کەسو کارم
ئاوارەو بێکەس ئەسووڕێمەوە
بە یادی مەڵبەند ئەبووڕێمەوە
هەرچەندە لە ناو عەشرەتی خۆمم
لە ناو کوردی زان دڵسۆزی خۆمم
بەڵام وام لە بیر ئەوە مەڵبەندمە
تیا لە دایك بووم ئەوە دڵبەندمە
هەزارو نۆسەد، وا شەستو پەنجە
ئێستەش لە ژیان ئەدەم سەرنجە
هێشتا بە تەمای ژیانم بۆ تۆ
بە دیموکراتی ئینجا سەربەخۆ
ئەمجارە ئەڵێم جا خۆزگە بە خۆم
لە بەری هەڵپەو کۆششم ئەخۆم

## بڵێ بەو هۆزە

بڵێ بەو هۆزە وا کورد نا پەرستێ
بە گیانی ئەو قەستەم ئیشی ئەوەستێ
ئەمە ناچێتە گیرفانی سەقافەت
بینای کوردی بڕووخێنێ خورافەت
ئەوەی بەندە لە مەڵبەندی دیارە
ئیتر (نەوحی) چییە ئەم بێ قەرارە؟

## با بژی کوردی عێراقی

بـــا بـــژی کـــوردی عێراقـــی قوتابخانـــەی زانـــستی
چـەند کەسـێکی پێگەیانـدو وا خـستیيە سـەر زانـستی
مەکتەبـــە زاخـــاوی هۆشـــو بـــیری زانـــا تیـــژ ئـــەکا
کـــێ بـــە دڵخـــوازی گـــەیی بێجگـــە لـــەوەی زانـــستی
تـۆ لـە بـاتی تـیرو خەنجـەر یەکیـەتی خـۆت بێنـە بـیر
قـــورِ بەســـەر هەســـتە نـــەماوە وادەی دانـــشتی
کوردەکـــان دابەشـــکراوی تـــورکو فـــارسو عـــارەبن
غـەیری کـوردی شـارەزای ئـەم سـێ خەتـەن زانـستی
کـێ بـە کێـری خـەڵقی گـانی کـردووە سـا پـێم بڵـێ؟[1]
جوولەکەش هەتا مەبەست نووسە خـۆ بـە پێـی زانستی
پێـــچەوانەی ئـــارەزووی ئێمـــە ئەســـوورێتو فەلـــەك
وەکـو خـەرِەك[2] ئێمـەش ئەرِێـسین کوڵکـەی[3] رِاخـستنی
زیـرەكو ژیـری تـۆ کەروێـشکە خەویـشی بـۆ ئەکـەی
تـانجی دەورەی لـێ تـەنیوی هەسـتە لـەم دانـشتنی
ناحـــەزی یاریـــتو یـــاری نـــا حـــەزو دوژمـــن پەرســـت
پێـــت بڵـــێن کوێخـــا ئـــەدۆرِێنی لـــە نـــا زانـــستی
مـن غـەمی تۆمـە لـە گـۆمی بـێ پـەیا خـۆم دەرنەکـەم
تـۆش وەکـو (نـەوحی) بخوێنـە بـیری خـۆ پاراسـتنی

١- ئەم نیو باڵە، ئاماژەیە بۆ پەندی (بە کـ...ی خەڵك گـ..ن ناکرێ). واتە: مرۆڤ بۆ دابینکردنی مافەکانی، دەبێت پشت بە خۆی ببەستێت، ئەگینا کەسێکی تر ئەوەت بۆ ناکات.

٢- خەرِەك: دەزگای خوریی و پەموو رِستن.

٣- کولکە: کولك، خوریی و موو.

## نەخۆشیی و بێکەسی

نەخۆشی و بێکەسی و بەندی بە جارێ
سەری لێداوم و نەماوە یارێ
خوای کورد و خوای عالەم بەزەییت
بە کوردا بێت و بۆ من بکە چارێ
ئەوەی کەوتە سەرپێ ناوێرێ بێ
لەپێ کەوتوو لە ترسا خۆی ئەشارێ
بڵێ لەم کاتی زێڕینە بە مێژوو
فەلەك ئامینی کوردووە کورد بتارێ
بڵێ بەو هۆزە وا کورد ناپەرستێ
لە لایەن مێژووەوە بەرد لێی ئەبارێ
ئەمە ناچێتە گیرفان سەقافەت
بینای کوردی بڕۆخێ هەر بە جارێ
ئەوەی بەندە لە مەڵبەندی دیارە
ئیتر (نەوحی) هاوار مەکە پڕ بە زارێ

## زانا و خوندەواری

زانایەو خوندەواری
هەمیشە پیشەکاری
بیهێنە کوردەواری
ئەمجا تەمات بەخۆ بێ
ئەی کاک تێنەگەیشتو
ئەی گەنجی پێگەیشتو
تا ئاغە دێ بژێتو
ئەبێ زامت بەسۆ بێ
پزیشکی دەردی کوردە
خوێندن بە دەستو بردە
ئامانجی زیرو وردە[1]
بنچینەی سەر بە خۆبێ
کوردە کەوا نەکردە
لە شارە یا لە هەردە
هەموو هەناسە سەردە
بژێوی خۆ بەخۆ بێ

١- زیر و وردە: گەورە و بچووک.

## دیاره له دوژمن

دیاره له دوژمن که نەترساوی
بۆیه سەرەکو هەم لێ پرساوی
جیاوازی نییه لەبۆ ئەندامیان
گۆشەگیریکا یا له فەرمانان
مەرجه جەنابت لەبۆ ئەمانه
ماف سووتێن نەبی وەکو ئەوانه
چونکه تۆ چاوی پارتی بەڕێزی
له دڵی پارتی خاوێن پەرێزی
منیش یەکێکم ئەندامی کۆنه
که لێم بپرسی ئەحواڵت چۆنه؟
مەرجه بە دەمی سکاڵای خۆم کەم
چی به سەرما هات، چی بەسەر خۆم کەم
ئەندامی پارتی جوانه یا پیره
بۆ سوودی حیزبی ڕاوێژو بیره
(نەوحی) پێنووسی وشکی تەواوه
هێشتا له دڵیا وته زۆر ماوه

## مۆژدەت ئەدەمێ

ئەی کاکی فەللاح مۆژدەت ئەدەمێ
ستەم نەماوە نە زۆر نە کەمێ
کەس دەرت ناکا لە شوێن و جێگەت
کەسیش ناوێرێ کە بگرێ ڕێگەت
سوورانەو[1] بەرتیل بێگاری[2] جاران
باوی نەماوە مۆژدە بێ یاران
ژیانی تازە وا پەیدا بووە
ستەمی نەهێشت ئەوەی کە بووە
بژی یەکیەتی بژی نیشتیمان
بەم کۆمارییە قوربانین گشتمان
لە دەست بەرمەدەن ئەم هەلە جوانە
کە حوکمی شەعبەو گەورەی خۆمانە
ئاینو مەزهەب جەمهووری ئێستە
ئاشتی ئەوێ لێت، تۆ ئاشتی بەستە
ئێوە کە دۆستو یەك دڵو دین بن
ئەبێ بۆ دوژمن هەر لە کەمین بن
ئەوەی دوژمنە کە ئێرەی ناوێ
ئێوەش لە گەڵیان مەنیشن تاوێ
پشتی یەك بگرن لە ڕێ دەرمەچن
ئەوەی کە لایدا بە دوویا مەچن
ڕەگو ڕەگەزی خۆت مەدۆڕێنە
لە کۆمەڵی کورد هەڵمەتۆڕێنە
هەر دیموکراتیو ئازادی کوردن
دیموکراتی ویست لە پێشا کوردن

---

١– سوورانە: زووتر لە کوردەواریدا نەریت وا باو بووە کە هەر بووکێك بگوێزرایەتەوە، دەبوو ئاغای دێ بە ناوی سوورانەوە خەڵات بکرایە، ئەگینا ڕازی نەدەبوو ئەو بووکە بگوێزرێتەوە.
٢– بێگار: کاری بەگ یان ئاغا بە زۆرداری، کاری زۆرەکی بە خۆڕایی و بەبێ بەرامبەر.

عەبدولکەریمە بۆ کوردەواری
دەرسی ئازادی هێنا بە دیاری
(نەوحی) لە بەر پێی شەهیدی وەتەن
بمرێ ژیاوە تانەی لێ مەدەن

## بڵێ بولبول بناڵێنێ

بڵێ بولبول بناڵێنێ بە ئاهی خونچە پشکوێنی
بە داخی خاڵی لێوی یارە جەرگو دڵ ئەسووتێنی
ئیشاعەی جەرگمی گرت پێی وتم بڕژاوی مەڵبەندی[1]
بڕۆ با بای وەتەن لێتدا بەسەریا ئاو بپەرژێنی
وتم منداڵی بێگانە ڕکی داوە لە جەرگی من
وتی ڕاوێژی نازانم مەگەر ڕیشەی بە دەربێنی
دڵم تێکچوو لە ڕاوێژی پزیشکو تێگەییم چۆنە
کە یاری سەربەخۆ نابێ بە هیچ کووجێ[2] بڕەنجێنی
وتم مەڵبەندی ئێمە پڕ هەوێنی گەوهەرە بۆیە
وەکو دەرمان بەسەد ئامان بە ئێمە ناگەهێنێ
لە چاوی کاڵو لێوی ئاڵو زوڵفی لوولی وا دەرکەوت
سەری بردو دڵی برد، ماوە ئیمانی کە بیبینێ
دە کوردە تۆ وەکو (نەوحی) بە ئازاری جگەر مەمرە
پزیشکی یەکیەتی بێنە ئەگەر ئازای هەڵیدێنی

---

١- لێرەدا بیری شوێن و شارۆچکەکەی خۆی دەکات کە زێدی باووباپیرانیەتی...
٢- کووج: شێوە، جۆر.

## له زەمانەی زووەوە

لە زەمانەی زووەوە ئەو کەسە کوردە زانی
پیتی بەرگی وەکو مەعنایە بە ڕێکی‌و جوانی
هەر کەسێ لوغەتی بێگانە بهاوێتە وتن
ئەو لە نێو عەرزی وەتەن تۆوی غەریبی چانی
ئاگری خستەوە ناو پووشی وەتەن هەر بە وتن
تێدەگا زیرەك‌و ژیرە وەکی تر نازانی
(مستەر)و (مرسی)و (سۆری)[1] چییە بیخەیتە وتن
پێت ئەڵێن زۆڵە کە ئەم فەلسەفەیەی چۆن زانی؟
یاڵنشە[2] یانی هەڵە گوزگییە[3] ئاوێنەیە خۆ
وشەیە یانی کەلیمە لە وتەی کوردانی
کەس بە تۆ ناڵێ تەماشا وەکو ناپولیۆنە
مەگەر ئەو وەختە بژیوی وەتەنی کوردانی
وەك مرشکێکی بە کڕ[4] بێت‌و لەسەر هێلکەی قاز
کڕ کەوێ جووجەڵەیی دێتە مەلەی بابانی
بە کەوای جاوی خۆت پینەی خامەك[5] مەدوورۆ[6]
وەکو دێو جامەیە[7] نابێتە زرەی[8] گوردانی
(نەوحی) سەرخۆشە لە خوێنی جگەری خۆی بۆ تۆ
تۆش کە بیخوێنەوە ئەیخەیە سەر گۆڕانی

١- هەرسێکیان وشەی بێگانەن...
٢- یاڵنش: وشەیەکی تورکییە، یانی: هەڵە.
٣- گوزگی: ئاوێنە.
٤- کڕ: کورك، مرشکێکە لەسەر هێلکە بخەوێ بۆ هەڵهێنانی جووجەڵە.
٥- خامەك: قەنەوز، خام، پارچەیەکی بنەوشی ئاماڵ سوورە لە ڕەنگی ئەرخەوان دەکات.
٦- مەدووروۆ: مەدوورێنە، مەدوورە، مەی دوورە (دروومان).
٧- دێوجامە: دیجامە، چەند پارچە پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگ لە یەك دەدەن و لە ڕاوەکەودا بە کاری دەهێنن.
٨- زرە: زرێ، سەرکەوای لە ئاسن هۆنراوەتەوە، لە کۆندا بۆ شەڕ لەبەر کراوە.

## تەمەنی جوانیم

تەمەنی جوانیم لە پێی دیدەنی
رۆیی کە رۆیی ئیتر نەمبینی
گەلاوێژی چاو و تەم هاتە سەری
چەپم رۆیشتو راستم نەبینی[1]
خۆزگە بەو کاتەی لە دەرگای ئەو بووم
لە باخی روویا گوڵم ئەچنی
گەر نەختێ خۆشی لە دڵما مابێ
هەوای کوردییە بە ئۆتۆنۆمی
سەر بەخۆیە خۆزگە ئەمبینی
مویی رەشم سپی رووی ئاڵم زەردە
دۆشەکم زەوی سەرین بەردینی
ئێستاکە پاشام کە ناوت ئەبەم
بەو مەرجەی ناحەز هەڵبخرچێنی
باخ و گوڵزاری خۆم وە دەست بێنم
شای ناحەز لە گۆڕ تێبترینجێنێ
وا (شەستو پەنجە) ئێستگەی کوردی
بە دەنگی کوردی تێئەچرکێنێ
کێ هەیە بڵێ (پارتی کوردستان)
بێ هێزە هەتا پێی بسەڵمێنێ
ئەوا تێگەییم، ئێستە پێگەییم
دوژمن بە خواری بۆ خۆت ئەبینم

١- شاعیر ئەم شیعرەی لە کاتێکدا وتووە کە هەستی کردووە تانە (پەڵە) کەوتووەتە سەر گلێنەی چاوی چەپی.

## کوردێکم ئەوێ[1]

کوردێکم ئەوێ ئەو کورد بژێنێ
نەك بەندی دڵی کوردم بپسێنێ
کوردێکم ئەوێ هەڵپەکا بۆ کورد
نەوەك لەبۆ خۆی بکا دەستو برد
کوردێکم ئەوێ کورد پێگەیەنێ
بۆ ژینی هەموان گەنج تێگەیەنێ
هەوڵو تەماشام لە بۆ کوردانە
دووهەم خەفەتم لەبۆ ژیانە
بەری شۆڕشی چوار هەزار ساڵەم
چۆن بدۆڕێنم من تەنیا ماڵەم
ژینێکم ئەوێ بە نامووسەوە
نەك بە دەسندەو[2] بە ناقووسەوە[3]
ژینێکم ئەوێ بەسەر بەستی بێ
نەك مووچە خۆری بە دڵ پەستی بێ
ئەی برای کوردی وەتەن مەفرۆشە
بە پارە خوێنی کورد هەڵمەلووشە
مەڵێ ژیانم ئەوێ ئیتر بەس
هەر چۆنێ ببێ وەکو فلان کەس
بە کوردی ژینم لەبۆ کوردانە
ئاینم هێزی هەر بە یەزدانە
لە هەر پێنج تیکەی گێتی بە جارێ
ئەوەی کە کوردە ئەکا هاوارێ
نەتەوەی کوردی تێگەیشتووە
لە سەد نەوەتی پێگەیشتووە
تازە ناخڵەتی بەو واتەو ویرە
ئەو چاوەڕاوەی هەر وا لە بیرە

١- نەوحی ئەم شیعرەی لە پاش شۆڕشی (١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ان) وتووە.
٢- دەسندە: شت پێدان بە ئەندازەی کەم.
٣- ناقووس: زەنگی گەورە کە لە کڵێسەکاندا هەڵی دەواسن.

کرێکار جوتیار دە ژێر بەرەوە
بڵێ من کوردم بیر بکەرەوە
هەر دیموکراتی ئازادی کردین
بەرەو سەربەستی بۆ خۆشی بردین
دەرەبەگ نەما هێزی نەماوە
زەویەکەی هەموو بۆ تۆ جێماوە
ئەتۆیش بیکێڵەو خۆت مەدۆڕێنە
وەکو گاکەی خۆت هەڵمەتۆڕێنە
پێشڕەوی ئێمە عەبدولکەریمە
بۆ کوردو عەرەب هەر ئەو زەعیمە
ئەویش بە یاساو بە دیموکراتی
ماوەی سەربەستی داوە بە (پارتی)
برادەر (نەوحی) هەرچیت عەرز ئەکا
گەوهەرەو تۆوی لەسەر عەرز ئەکا

## چوار کاتی ساڵی کوردی

چـــوار کـــاتی ســـاڵی کـــوردی باســـیکەم باشـــە بـــرا
یـــەك بـــەهارو هـــاوینو، پـــایزو زســـتان نووســـرا
هـــەرمێ پـــشکوان، شەســـتە بـــاران، بەختـــە بارانـــە بـــەهار
هاوینـــە بـــاران بـــڕان، مێوەگـــەنان، گەلاوێـــژ بـــرا
یـــەك هـــەوەڵ پـــایز گـــەڵاڕێزان ئەویـــشی کەوبـــەدار
یـــەك هـــەوەڵ زســـتان چـــلەبازە بـــەرانیش تێپـــەڕا
ڕۆژ ژمـــارەی شەمـــسییە[1] هۆشـــت بـــبێ تێکـــی نـــەدەی
کوشـــتنی پـــیری حـــەمووراب مێـــژووی تـــۆ دانـــرا
هـــەرمێ پـــشکوان ســـیو یـــەك، شەســـتەباران ســـی تـــەواو
بەختـــەباران ســـیو یـــەك کـــاتی بـــەهاریش تێپـــەڕا
ســـی تـــەواو بـــاران بـــڕانو ســـیو یەکـــە مێـــوە گـــەنان
کۆتـــایی هـــاوین گەلاوێـــژ، ســـیو یـــەکی بـــۆ دانـــرا
ســـی هـــەوەڵ پـــایز گەڵاڕێزانـــە ســـیو یـــەك مـــانگی دوو
کەوبـــەدار ســـی ڕۆژە ئـــەمجا، پایزیـــشمان تێپـــەڕا
بۆ هەوەڵ زستانە سیو یەك بۆ چلەش سیو یـەك بـەڵام
بیـــستو هەشـــت بازەبـــەران، وێنـــەی شـــوباتە دانـــرا
مێـــژووی هیجـــری هـــەزارو سێـــسەدو حـــەوتاو ســـێ
کـــوردە مێـــژووی چـــوار هـــەزارو دوو ســـەدو چـــل بینـــرا
دوو هـــەزارو دوو ســـەدو هەشـــتاو شـــەش بـــەر عیـــسەوی[2]
کـــەوتووە مێـــژووی ئێمـــە دەس بـــە دەس وا هێنـــرا
بـــیری تیـــژی پـــێ دەوێ هـــەڵگرتنی ئـــەم هۆشـــەیە
(نـــەوحی) قـــازانجی ئـــەتۆی دیبـــوو کـــەوا پێـــی نووســـرا

١– شەمسی یان خورشیدی: لە ئێران لە جیاتی ساڵی زایینی، ساڵی خورشیدی بەکار دێنن.
٢– عیسەوی: مەبەست لە ساڵی زایینییە.

# چەن قارەمانی کورد

سێ سەڵتەنەت لە کوردی بێ مەکر و فێڵ و تەلبیس[1]
پێکهاتوون بە جارێ بێ فاکوفیکی ئینگلیس
کوردی سەلاحەددینی ئەیووبی شاهی ئەووەڵ
سەرپاکی کوردو گۆران وەزیر و هەم موهەندیس
زانستی دەستی بۆ برد مێژوو ژیانی بۆ کورد
نەزانی وا لە ناو برد ئەمری ئەدا بە تەدریس
لە ڕەسمی[2] نووسی پیتی زمانی کۆنە ئێستاش
ئەم خەتتە ڕاستە چەوتی مەکە بە ناوی تەدریس
پاش چەن سەدە (کەریم خان)[3] گرتی تەواوی ئێران
ڕەندێکی وەك سلێمان ڕووی کردە شاری بەلقیس
نە یار دەمێکە دوژمن بە ئەسڵ و نەسڵی تۆیە
ئەی بێ خەبەر، خەبەر بە لە خانی پوورە بەلکیس[4]
هەرچی کە پێی ئەڵێن کورد درێژو کورتە یا ورد
مەیهاوە[5] ژێری زنجیر کاتێ ئەبیتە پۆلیس
نەزان لە مێژێ دوژمن بە هۆزی تێگەیوو بوو
گەر خێوی ژێری ئەمجا مەچۆرە بیری بەلکیس
وەك ئەهلی خاکی عێراق هەرچەندە گەورەترین
بەگزادە بن لەگەڵ یەك مسکێن ئەبن بە موونیس[6]
تۆ بیر بدەرە واتەم، با تەم نەیەتە سەرچەم
(نەوحی) لە داغی ناحەز وەختە بچێتە تەفلیس

---

١- تەلبیس: لەبەرکردن، پۆشین.

٢- ڕەسم: نەریت، شکل، وێنە، لێرەدا مەبەست لە ڕێنووسە.

٣- کەریم خان: کوڕی (ئیناك)ە بە تیرە (زەند)ەو لە هۆزی (لەك)ە، لە ساڵی (١١١٣ك) لە ئاولیی (پریە) لە خاکی (مەلایر) لەدایك بووە، دوو کوڕی هەبووە بەناوەکانی (ئەبولفەتح خان و ڕەحیم خان)ـەوە. لە ساڵی (١١٤٠ك) چووەتە ڕیزی سوپای نادر شای ئێرانەوە، تا بووە بە سەرکردەی سوپا، لە تێکچوونی ئێراندا بۆ ماوەی (٢٨) ساڵ (١٧٤٦–١٧٧٤ز) بووە بە پاتشای ئەو وڵاتە. لەو ماوەیەدا ئاڵای دادپەروەری و سەربەستی بۆ میللەت دابین کردووە. ئەم زاتە سوارێکی زۆر ئازاو چاو نەترس، وریا و ژیرو ڕووناکبیر بووە. لە تەمەنی (٨٠) ساڵیدا مردووە.

٤- بەلکیس: مەلیکە بەلقیس- بڕوانە: بەلقیس.

٥- مەیهاوە: مەیهاوێژە، مەیوەشێنە.

٦- موونس (موئنیس): هاوڕێی گیانی بە گیانی، ئەو هاوڕێیەی تەنیایی خۆتی پێبەڕێتە سەر.

## واتەیێ مەشهوورە[1]

واتەیێ مەشهوورە وتەی پێشینان
دووپشك بە دووپشك دەردێ لە كونان
تەئریخی هیجری نۆسەدو نەوەت
تا بە هەزارو پەنجاو پێنجیان
شیعەو سونیەتی بوونە ماشەی دەس
كورد قڕانێ بوو دوژمن ڕای ئیمان
یەكجا نۆسەدو بیستو نۆی هیجری
خوێنی كوردەكان بە گەرمی ڕژان
شارەزوور چونكە سەربەخۆی نەما
كەوتە سەر بەشی حوكمی موكریان
كەسێكی نەما كە بیری تیژ بێ
لە هەردوو لاوە ئەیانكرد تالان
لە بەینی ڕۆم و ئێرانیانیش
شارەزوور زۆری سكی هەڵدڕان
لە هەردوو لاوە كوشتاری یەكیان
بە غەزا داناو نیشانەی ئیمان
بەلام لە سالی هەزارو سیو شەش
(حافز پاشا)[2] سەر عەسكەری ڕۆمیان
لە ئەستەموولەوە هاتەوە مووسڵ
گەورەی كوردانی ئەوێی خەڵەتان
بە ناوی گەورەی جیهادی ئەعزەم

---

١- ئەوحی لە پێشەكی شیعرەكەیدا، ئەم چەند دێڕەی تۆمار كردووە:

تێچینێكی بە هێزی حافز پاشا
سەر عەسكەری ڕۆمیان بۆ كوردی هەردوو لای بە قڕدا
لە نۆسەدو نەوەتی هیجرییەوە هەتا
هەزارو پەنجاو پێنج سالْ درێژەی كێشا

٢- حافز پاشا: سەردارێكی سەربازی سەردەمی توركە عوسمانییەكان بووە.

جەنگ کردن لەگەڵ قزڵباشیان[1]
وتی غەزایە پێویستە لە سەر
هەموو سوننییە بە ماڵو بە گیان
زاناو ڕۆحانی کوردی ئەو وەختەش
پارەیان خواردوو فەتوایان بۆ دان
شێخ شەمسەدین[2] بوو لەو کاتەدا
بە شێخی وەرمێ[3] ناوبانگو نیشان
پیاوێکی گەورەو وتە ڕەوا بوو
بە دینو ئازا خاوەن نانو خوان
کەوتە نناو جەرگەی کوردستانەوە
هەمووی وەرگێڕاو بیری لێ تێکدان
چوون خەڵەتاوی حافز پاشا بوو
زۆر پێی کوردانی لە ڕێ هەڵخزان
حافز شادومان بەم جەماوەرە
بۆ کەیف خۆش نەبێ، لە بیری کوردان؟
بێ جەنگو پارە لەشکرێکی وا
پاکی پاڵەوان هەم جەنگاوەران
حافز کوردانی یەك بانگ ئەکرد
ئەم چاوەڕاوەی ئەخستە مەیدان
ئەیوت مەرقەدی زیارەتگاهەکان
بوونە تەویلەی قزڵباشەکان
فەرزە لە سەرمان بیهێنینە دەس
سەرو گیانو ماڵ بکەین فیدایان

١– قزڵباش: واتە: سەرسوور کە بریتی بوون لە موریدەکانی شێخ حەیدەری کوڕی شێخ جونەیدی سەفەوی کوڕەزای شێخ سەفیەدینی ئەردەبیلی سەفەوی. بە ڕەچەڵەك کورد بووە، ئەم شێخ سەفیەدینە فەرمانی پێدان کە مێزەرێکی دوانزە گرێی سوور ببەستن کە نیشانەی هەر (١٢) ئیمامەکەی شیعەیە، لە بەر ئەمە ناویان نرا قزڵباش.

٢– شێخ شەمسەدین: خەڵکی شاری ورمێ بووە، زانایەکی ئایینی کوردی ئەو ڕۆژگارە بووە، حافز پاشا بە فرۆفێڵ تەفرەی داوە و فەتوای پێداوە کە هەر کوردێك لەگەڵ سوپای تورکدا بجەنگێ بێ ئایین دەبێت و جێگایشی دۆزەخە، ئەوحی لە جێگایەکی تریش ناوی ئەم شێخ شەمسەدینەی هێناوە کە لە سەردەمی سوڵتان مورادی چوارەمدا هەمیسان بەو فەتوا شوومەیەوە تاوانباری دەکات.

٣– وەرمێ: ورمێ، ڕەزاییە، شارێکە لە خۆرهەڵاتی کوردستان.

وه نەبێ وابێ ئەمەش دوو ڕوو بوو
ئەم بێ حورمەتییە نەبوو لە بیریان
بەڵام وتەیەکی بە دەستو برد بوو
سەرداری عەسکەر خەلیفە، کردیان
چشتێکی وەها بە ملیۆن لیرە
نەدەفرۆشرا بە واتە کردیان
بۆچ ئەو واتەیە ئەبێ کە نەیڵێ
حافز سێ هێزی بۆ پەیدا کران
یەکەم لەشکری کەم بوو زۆری کرد
دووەم ترسێکی هەبوو لە کوردان
سێیەم کە پارەی بۆ گردەوە بوو
یانی ئیعانەو[1] کۆمەکی کوردان
حافز بە پشتو هێزی کوردەوە
لە ئەستەمبوولەوە بۆ بەغدا جوولان
بە ئەمری حافز کوردی خەڵەتاو
دەورەی بەغدایان تەنی بە شیران
ڕۆمی لە ناو خۆی تێکو ئاڵۆزا
وە خوسرەو پاشای[2] یەنیچەرییان[3]
کە چاوی پێکەوت کورد بە یەک دڵی
سەربەستو نەترس چوونەتە مەیدان
زۆر چاک تێگەیی بەغدا بە دەستی
کورد ئەگیرێت و ناوبانگە بۆیان
یەنیچەریانی خستە سەر هەوەس
سەرکەشی و[4] یاخی و جەنگ نەکردنیان
یەنیچەریانیش ئاڵای سەرکێشیان

١- ئیعانە: یارمەتیدان، باربوو، ئاوڕلێدانەوە.
٢- خوسرەو پاشای یەنیچەریان: ئەو فەرماندەیەی عوسمانییەکانە کە لەگەڵ مەلا ئیدریسی بەتلیسی و بیغلی محەممەد پاشادا، میرنشینە کوردەکانیان لە سەرەتای سەدەی شانزدەیەمی زایینیدا خستە پاڵ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی.
٣- یەنیچەری: ئەم وشەیە لە دوو وشە پێك هاتووە و هی سەردەمی عوسمانییەکانە. یەنی: نوێ، چەری: سەرباز.
٤- سەرکەش: یاخیبوون، سەرپێچی.

هەڵداو چوونە لای حافز بە جوێندان
لەو کاتە پیاوی ناردراوی شاهی
ئێران لەوێ بوو لە بەر چاوییان
سووکیان کرد، تێیان هەڵداو دەریانکرد
وتیان جەنگ ناکەین قەت لەگەڵ ئەوان
حافز پاشایان گرت بە پەتپەتی
پەتیان لە مل خست بە ڕوو ڕاکێشان
هەتا کۆڵانی ئیمامی ئەعزەم[1]
بە سەر شەقامدا هەر بە ڕاکێشان
کوردیش لە دەورەی قەڵا بەرامبەر
بە دوژمن شەڕیان ئەکرد هەموویان
ئاگایان نەبوو لەم کەین و بەینە
وەکو لەشکری شیعەی ئێرانیان
بەڵام لەشکری ئێرانییانیش
بۆ کوشتنی کورد بە گەرمی کۆشان
کوردی بێچارە گەلێکی نەما
دەورەی قەڵایان بەرداو داخشان
لە شا عەباس[2] سەفەوی بدوێین
بە لەشکرێکی قورس لە هەمەدان
بە کوردستانا ڕکێف کوت ڕۆیی
بۆ بەغدا، هەرچەند ئاوایی کوردان
کە هاتە پێشی هەموو سوننی بوون
وێرانی کردو سگی هەڵدڕان
یەکجا لە دەورەی شارەزوور هەموو
نێرو مێ و منداڵ شیعە کوشتیان

١- ئیمامی ئەعزەم: نوعمان کوڕی سابتە (٧٠–١٥٠ك) نازناوی ئیمامی ئەعزەم و ئەبوحەنیفەیە، ئارامگەکەی لە بەغدا لە گەڕەکی (باب المعظم) دایە. سەرۆکی یەکێ لە چوار مەزهەبە سوننییەکانە.
٢- شا عەباسی سەفەوی (١٥٧١– ١٦٢٩ز) لە ساڵی (١٥٨٧ز) بووەتە شای ئێران، بە (الکبیر) ناسراوە. لە کاتی خۆیدا دەستی بە سەر: بەغدا، کەربەلا، نەجەف، مووسڵ، دیاربەکردا گرتووە و خستوونیەتیە ژێر حوکمڕانی خۆیەوە.

قەلای مەریوان[1] زەلم[2] و گولعەنبەر[3]

ڕۆخێندران و شوێنەکەی سووتان

بە کورتی بیڵێین تا وەکو بەغدا

ئەوەی ئەو کوردی تۆ نایکەی بەوان

یەنیچەریانیش لەسەر سەرکێشی

خۆیان ماتەدا بە گوفتەو پەیمان

بۆ چوونە مووسڵ بۆ کورد کوشتنیش

کەمەر بەستە بوون هەموو لە مەیدان

بەلام کوردانێ کە تەرەفداری

ڕۆمیو وەرمێ بوون هەموویان شکان

بە پەریشانی بە شپەرزەیی

هەموو خۆی کوتا بۆ کەژی کوردان

یەنیچەریانیش هەر هەموو شکان

ڕوو بە دیاربەکر تا حەلەب ڕەمان

واتەی کوردییە کارێکت پێکەم

شا عەباس نەیکا بە جەرگەی کوردان

شا عەباس وەختێ گەیشتە بەغدا

هەرچەندێ کوردی سوننی بوون کوژران

لەوسەریش کاتێ کە شا هاتەوە

ئەوەی کە مابوو لە کوردی فەوتان

یەکجا شارەزوور تووشی دەردێ بوو

پڕ بوو لە خوێناو کۆردەرەو[4] کۆریان[5]

نە ئێران ڕەحمی بە کوردی ئەکرد

---

١- قەلای مەریوان: قەلایەکی کۆنە لە نزیك شاری (مەریوان)ەوە. بەسەر لوتکەی شاخێکەوەیە. (قەلای مەریوان پالمدا پێوە.. قەلاکە ڕۆخیا پالدەم بە کێوە)- فۆلکلۆر.

٢- زەلم (قەلای زەلم): ئەم قەلایە مەلبەندی میرنشینی شارەزوور بووە، دەکەوێتە ناوجەرگەی چیا سەختەکانی سەر ڕێی کەرکوك و تەورێزەوە. لە سالی (٥٦٤ك) بەرامبەر بە سالی (١١٦٨ز) لە لایەن بابا ئەردەلانەوە دروست کراوە. نۆ کیلۆمەتر لە ناحیەی خورماڵەوە دوورە.

٣- گولعەنبەر: لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بە شارۆچکەی خۆرماڵ و تێکڕای شارەزووریان وتراوە (گولعەنبەر).

٤- کۆردەرە: دۆڵ و دەرەی قووڵ و بن بەست، دەرەی بێئاو.

٥- کۆریان: ئاودڕ، ئەو شوێنەیە ئاودڕی دابێت و بووبێتە نیوچە کەندەلان.

نە ڕۆم بەزەیی هاتووە پێیان
کوردی شارەزوور کوردی ئێرانی
کوردی شیمالیش[1] هەموو بە یەکسان
تا وەکو سێ ساڵ نیوەی بە خەفەت
نیوەی شپرزە، نیوەی ئەکوژران
ئەمەش لە چارەی شیعەو سونیەتی
ئیمان وا ئەبێ خەلیفەی زەمان؟
ساڵی هەزارو سیونۆ لە هیجری
یەنیچەرییەکان خوسرەو پاشایان
کردە سەرداری سوپای لەشکری
هەموو ڕێکەوتن بۆ بەغدا گیران
لە ئەستەمبووڵەوە لە مانگی مەولوود
گەیشتنە مووسڵ لە وەختی زستان
ئاغاو بەگی کورد بۆخوسرەو پاشاش
بەبیری پێشوو بۆی هەڵخەڵەتان
لەلایان وابوو کە موجاهیدن
ئەرێ نەوەڵڵا هەموو جاهیلان
هەر ئەو کوردانەن لەحافز پاشاش
گردەوە بووبوون بە دڵ و بەگیان
خوسرەویش دڵی پڕ لەخەفەتە
لە بەغدا قەدریان نەگرتووە کوردان
ڕوو ترشی نواند لەگەڵ کوردەکان
هەموو بەسوکی تەماشا کران
چا بوو کوردەکان بیریان هاتەوە
لە واتەی خۆیان بوبوون پەشیمان
وتیان بەبێ سوود ئێمە گیان فیدا
بە هیچە خوسرەو دڵمانی ئێشان
لەناو لەشکرا هەموو دەرکەوتن

---

١– شیمال: ژوورووی، مەبەست لە باکووری کوردستانە.

هەڵیاندا خێرا بەیداغی ئێران
بانگی دوژمنی ڕۆمی نەویستن
ئێرانیم ئەوێ شاهی سەفەویان
کە خوسرەو پاشا بە گوێی خۆی بیستی
زۆر پەشیمان بوو لەو حاڵە تێدان
بەڵام کوردەکان باش گردەوە بوون
مەکۆ[1] و کرکیتیان[2] خستە چیاکان
نامەی دۆستیەتی پەیامی خۆشڕەو[3]
بردی بۆ خزمەت شاهی ئێرانیان
مایەی ئەوەندە ڕووکرژ کردن بوو
دڵی کوردانی لە خوسرەو ئێشان
خوسرەو خۆی کوردی وەرگێڕا لە خۆی
کردنیە دۆستی شاهی ئێرانیان
هەر ئەمەش سەبەب یەک کەوتنی بوو
بچێ شارەزوور وە بیکا تالان
ئەگەر چی کوردان لە پێشدا بوبوون
بۆ خوسرەو پاشا هەموو پشتیوان
خوسرەو قەراریدا کە سەر ئەمە
بچێتە شارەزوور، سەر خاکی کوردان
هەرچی سەر ڕەقە سەر نەرمی بکا
دێ بسووتێنێ لە پاش کوشتنیان
لەشکری دەنگدا ڕوو بە کوردستان
لە بەهارا بوو لە مانگی گوڵان
دوژمن کە پیشەی چی بوو ئەوەی کرد
سووتانی کوشتنی دێهات و پیاوان
تاکو واریدی[4] چەمی پردێ[1] بوو

---

١– مەکۆ: مەکۆك، ماکۆ، مەکوو، کەرەستەیەکی جۆلاییە.

٢– کرکیت: کەرکیت، کەکیت، کەرەستەیەکی تەونکارییە، دەمەکەی لە تەل لە شێوەی شانە دەچێت.

٣– خۆشڕەو: خۆشڕۆ، لە ڕۆیشتندا بەکار و خێرا.

٤– وارید: گەیشتوو، هاتوو.

زێی گچکە هەستا هاتو ئەیلوران
مەشکەیان فووداو کەڵەکیان لێ بەست
کە بپەڕنەوە تا بانگی شێوان
بەشێکی خنکا، بەشێ دەرباز بوو
بەشێ مایەوە کەوتە سبەینان
شەوێ کوردەکان لەمبەرەو لەوبەر
شەبەیخونیاندا[2] بە هەردوو بەشیان
گەلێ تالان و کوشتاریان کرد
جبەچیباشی[3] و هەمزە ئاغایان[4]
سەربڕی یەعنی هەر لەو شەوەدا
سبەینێ سەرو لاشەی ئاغایان
دییەوە بەڵام، چ دۆزینەوە
هەر بەوە نەما گیان و سەروەتیان
ئەو شتومەکەی کە پارێزراو بوون
شەو لافاوێ هات ئەویشی ڕادان
هەر لەو شەوەدا لە ئەستەمبووڵیش
کۆشک و ماڵەکەی خوسرەو کە سووتان
ئەمەش لە سایەی دڵ ساف ئێمە
بژی بژێوی کوردی زوومانان
چاک بیری بەرێو باش بیخوێنەوە
بیبەرە کەللەی نەخوێندەواران
ئەگەر چی (نەوحی) ڕێکی خستووە
بەڵام تەئریخەو مێژووی کوردستان

---

١- چەمی پردێ: زێی بچووك، زێی گچکە، بە ناو شارۆچکەی پردێدا تێپەڕ دەبێت. پردێ سەر بە شاری کەرکووکە.
٢- شەبەیخوون: پەلاماری شەوان بۆ سەر دوژمن (شەبەخوون) و (شەبخوون)یشی پێ دەوترێت.
٣- جبەچیباشی: ئەوەی بەرپرسی (جبەخانە)یە، واتە: کەرەستەی جەنگ.
٤- هەمزە ئاغا: ناودارێکی کورد بووە لە (پردێ).

## زەنگنەی ئێمە

زەنگنەی[1] ئێمە لە بیرو تیرەو سواریدا هەڵکەوون
ڕووکەنە پۆلی نە یاری هەر قەڵایی سەرکەوون
شێری سەرشیو، ئاغا ساڵح[2]، تاڵە جادر بێشەی ئەوە
ڕەنگەرێژانە حدوودی پایتەختی خوسرەوون[3]
دا بەشێکی وا لە (کرماشان)و زەینەڵ مولکییە
تانو پۆی میری حوکمڕانی قولیخانی[4] ئەوون
(میر سمایل)[5] وا لە عێراقا نەبیرەی زۆرە خۆ
ئەم هەموو مسکێنە لەونو ئاغەکان غەیری ئەوون
ئاغەواتی (مام برایم خان)ی[6] دووسەد زیاترن
پڕ دەماغو دڵ بە داغی ناحەزی کوردی ئەوون
(گۆڕ قەرەج)[7] وێرانە ئەمما ئاوەدانە تا ئەبەد
چونکە (حاجی قادری) کۆیە[8] لە خۆڵەکەی ئەوون
تێگەیی و گەر هەڵکەوێ خۆ پێگەیی و دەس ناکەوێ
(نەوحی) تۆ غەمیان مەخۆ جاهیل بە هیچ سەرناکەوون

---

١- زەنگنە: هۆزێکی گەورەی کوردە، لە ئێراق و ئێراندا هەن. بە دیالێکتی گۆران دەدوێن. بە پێی شەرەفنامەی بدلیسی، لە ڕۆژگاری دەسەڵاتداری شا ئیسماعیل سەفەویدا، گەشەی زۆریان کردووە و پلەوپایە و سایە و مایەی فرەیان بۆ پەیدا بووە. لەوانە بوون کە ناحەزانی دەور و بەر ئیرەییان پێ دەبردن، بەڵام کە میرەکانیان لە ناوچوون، ئەوانیش بڵاوبوونەوە و بوونە خزمەتکاری قزڵباشان و لە ئێراق و خوراسان دامەزران و هەندێکیشیان لەگەڵ پاسدارانی پایەبەرزی شا دانران.

٢- ئاغا ساڵح: لە کوردستانی خۆرهەڵات، سەرۆکی هۆزی زەنگنە بووە.

٣- خوسرەو: لە کوردستانی خۆرهەڵات، سەرۆکی هۆزی زەنگنە بووە.

٤- قولیخان: لە ڕۆژگاری کۆندا، میری زەنگنە بووە و لە کوردستانی خۆرهەڵات حوکمی میرنشینی کردووە.

٥- میر سمایل: کوڕی نەوشیروان بەگی زەنگنەیە. لە لاپەڕە (٦٢٤)ی شەرەفنامەی بەدلیسیدا دەربارەی ئەم زاتە مامۆستا هەژار نووسیویەتی (ڕەشید ئاغای زەنگنە لە کتێبەکەی خۆیدا کە هێشتا چاپ نەکراوە، دەڵێت: لە چەرخی نوازدەیەمی کۆچیدا، میر سمایل میری زەنگنە بوو کە لە پاشان بۆ عوسمانیان ببووە گزیری کەرکووك). مەلا و فەقێ و شاعیری خۆش دەویست. کاروانەڕێی ناو دەربەندی باسەرە و ڕۆخانەی خۆش کرد و لە پاش ئەو، ئەلقاسی کوڕی ببووە سەرۆکی زەنگنە. پاش ئەویش، ئەحمەد بەگ و محەممەد ئاغای کوڕی پێڕادەگەیشتن. ئەحمەد، محەممەدی وەدەرنا و ئەویش پەنای بە ئێران برد و جوانڕۆیان پێ سپارد. محەممەد ئاغا بە قەسیدەیەك گلەیی لە برای دەکات و دەڵێت (نمەز چێش باچۆم زوبان بەستانەن.. وەرنە تەرك زێد چ تەور ئاسانەن). بەرهەمەکانی ڕەشید ئاغای زەنگنە لەلایەن نووسەری ئەم بابەتەوە لە ساڵی (٢٠٠٦ز) چاپ کراو کەوتە بەردەست و دیدی خوێنەران.

٦- مام برایم خان: کوڕی مەحموود بەگ کوڕی ئەحمەد بەگ کوڕی میر سمایل نەوشیروانی زەنگنەیە.

٧- گۆڕقەرەج: گوندێکە سەر بە شاری کۆیە، حاجی قادری کۆیە لەم ئاواییە هاتووەتە جیهانەوە.

٨- حاجی قادری کۆیە (١٨٢٤-١٨٩٧ز): شاعیرێکی بەناوبانگی کوردە، خەڵکی کۆیە بووە و لە هۆزی زەنگنەیە.

## برادەر با زەمی هیچ کەسێ نەکەین

برادەر با زەمی هیچ کەسێ نەکەین
قوڕ پێوی کورد بین بۆ کەسی نەکەین
تاکو خاوەنی ئەم بیرو هۆشەین
بە سەر نەیارا گونشۆڕی نەکەین
خەڵوەو نەخواردن چللە کێشەکان[1]
تەنیا بۆ خۆیە پەسەندی نەکەین
نەختێ لە دەستەی کوڵکە نەزانان
ئەڵێن درۆیە بە هیندی نەکەین
لە واتەی کوردی ڕابوردەکانمان
ناگێڕێتەوە، حەلاوی[2] نەکەین
کوردەکان پاکیان[3] لە دەس (حەموراب)
هەڵاتن وتیان شارێکی بکەین
شارێکیان دانا بە زۆری بازوو
یانی شارێکەو بە زۆری ئەکەین
لە پاشا ناویان لێنا شارەزوور
وتیان وا چاکە خۆ کۆوە بکەین
وەك گردەوە بوون بیریان هاتەوە
وتیان با چارەی (حەموراب) بکەین
(حەموراب) گیرا کوژرا ئەو ڕۆژە
ناونرا نەورۆز پیرۆزی ئەکەین
دوو هەزار و دوو سەدو هەشتاو شەش
لە پێش میلادی عیساوی ئەکەین
بە ئاو قووم کرا شاری شارەزوور
جێگەو شوێنەکەی کە ناوی ئەبەین
دەریاچەی خۆرماڵ قەزای هەڵەبجە

---

١– چللەکێش: لە ڕێبازی سۆفیگەریدا نەریت وایە هەندێ جار سۆفییەکان بۆ ماوەی چل ڕۆژ دەچنە خەڵوەوە و دەرناچن.
٢– حەلاو (حەلاوە): شیرینی.
٣– پاکیان. هەموویان، هەرهەموویان.

داوای مێژوویی لە (حوزنی)[1] ئەکەین
خاکی شارەزوور لە ناو لێنانی
هەتا ئیسلامی مێژوویی ئەکەین
شەرقەن ئەکبەتان[2]، غەربەن لە زاخۆ
دەریاچەی ورمێ شیمالی ئەکەین
لە جنووبەوە بابیل[3] و ئیلام[4]
بەلام لە پاشی ئیسلامی ئەڵێن
لە قرمسێنە[5] هەتا زێی گەورە[6]
لە جەوەڵ حەمرین[7] بۆ موکری ئەبەین
بەلام لە دەورەی عەباسییەکان
تەئریخ چی دەڵێ ئێمەش وا ئەڵێین
خوراسان[8] ئەڵوەند دینەوەر[9] هەموو
بە شارەزووری زوو مارە ئەکەین
مەبەستی (نەوحی) تێگەیشتنەو
یەکیەتی، بەلام بڵاوی ئەکەین

---

١- حوزنی: مێژوونووسی کورد حوسێن حوزنی موکریانی، لە ساڵی (١٣١١ك) لە شاری مەهاباد لە گەڕەکی حاجی حەسەنیان لە دایك بووە. لە ڕۆژی (١٩٤٧/٩/٢٠ز) لە شاری بەغدا مردووە و تەرمەکەی گوێزراوەتەوە بۆ هەولێر و لەوێ سپاردەی گڵ کراوە.
٢- ئەکبەتان: هەمەدان.
٣- بابیل: ئەو شارەیە کە دەکەوێتە سەر ڕۆخی فورات و لە ژێر زەماندا نەمروود دروستی کردووە، ئێستا (حیللە)ی پێدەڵێن.
٤- ئیلام: شارێکە لە کوردستانی خۆرهەڵات، دانیشتوانی بە شێوەزاری کەلهوڕی دەدوێن.
٥- قرمسێنە: ناوی کۆنی کرماشانە.
٦- زابی گەورە: زێی گەورە.
٧- جەوەڵ حەمرین: زنجیرە چیای حەمرین.
٨- خوراسان: وڵاتێکی کۆنە لە ئاسیا، لە ئەمڕۆدا بە سەر ئێران و ئەفغانستاندا دابەش کراوە.
٩- دینەوەر: شارێکی کوردنشینە لە ئێران.

## یادەوەری سەلاحەددینی ئەیووبی

لە مێژووی پێنج سەدو شەستو دووا بوو
لە میسرا کوردی ئێمە سەربەخۆ بوو
جەنابی قارەمانی ئەیوبیی کوردی
کە حوکمی سەڵتەنەت بوونی لە خۆ بوو
لە ڕیشەی ئارییانە کۆمەڵی کورد
لە مێژوودا بزانە بێ درۆ بوو
مەکە باوەڕ بە نازانستی مێژوو
بە بیری بێنەوە تۆ بۆچی وا بوو؟
هەموو گوردانی دەورەی ڕۆستەمی[1] زاڵ
بە گۆران ئێستە مەشهوورن لە زوو بوو
هەموو ئازاوو زاناو زیرەکو ژیر
نەبیرەی پاڵەوان لەی تانو پۆ بوو
لە پیشەو عیلمی ئەشیاو فەننی مێژوو
هەموو پیاوێکی ناپلیۆنی تۆ بوو
بە واتەی غەیبەتو بوختانی یەکتر
کە چاکو باش و ناباشی تۆڕۆ[2] بوو
وەزیفەی تۆ نییە کینەو تەرەفدار[3]
مەکە تەقلیدی، دەستەی ڕەنجەڕۆ بوو
وەکو (نەوحی) بە زانستی لە مێژوو
بخوێنە جا ئەزانی چۆنە چۆن بوو

---

١- ڕۆستەم: کوڕی زاڵە، لە شانامەدا ناوی هاتووە. پاڵەوانێکی زۆر ئازاوبەهێز بووە.
٢- تۆڕۆ: ڕۆ ڕۆ. داخ و حەیف بۆ مردوو. واتە: تۆ لە نەوەی سەرۆك و پاڵەوان و سوارچاکی، بەڵام لەبەر ئەوەی یەك نین و هەر خەریکی بوختان و قسەی پاشملەن، نەبوون و دەستەونەژنۆ دانیشتوون و بەدەم گریانەوە ڕۆڕۆتانە.
٣- تەرەفدار: لایەن. واتە مەبە لایەنی ناحەز یان دوژمنانی نەتەوەکەت.

## له خاکی ئەکبەتان

لە خاکی ئەکبەتان تا دێتە زاخۆ
هەموو کوردن لەبەر کۆبێت و پشتکۆ
لەبەر وەرمێ و لە پشتی میاندواوە[1]
هەتا ئەرِوا رِەوان و دێتە باکۆ
لەبەر مازەندەران[2] دێتەوە وان
لەوێوە بێرەوە بۆ پشتی سمکۆ[3]
بە سەر بۆتان و خاپوورا[4] وەرە تا
تەنشتی لاتەلانی پشتی زاخۆ
بچۆ بۆ کۆردەرەی[5] نزیکی بەغدا
لەوێوە رِووکە قەسری[6] یاری شێرۆ
لە کرماشانەوە تاکو هەمەدان
هەموو خۆیین لە خوێنی تۆن لەبۆ تۆ
نەڵێی (نەوحی) خەیاڵی خاوە ئەیکەی
لە (ئاوباریک)ەوە[7] دانیشتووی تۆ

---

١- میاندواوە: شارۆچکەیەکە لە کوردستانی خۆرهەڵات.
٢- مازەندەران: ناوی ناوچەیەکە لە باکووری ئێران، لە دەوروبەری دەریای خەزەر.
٣- سمکۆ: ناوچەیەکە لە کوردستانی خۆرهەڵات، نزیکی قەزوینە.
٤- خاپوور: رِووبارێکە لە نێوانی کوردستانی باشوور و خۆرئاوا. سەرچاوەکەی لە چیاکانی دهۆک و زاخۆوەیە.
٥- کۆردەرە: دۆڵ و دەرەیەکی بێ ئاوە لە نێوانی قەرەتەپە و قنگریاندایە لە ناوچەی شاری کفری لە دەڤەری گەرمیان.
٦- قەسر: شارۆچکەی قەسری شیرین، سەر بە کوردستانی خۆرهەڵاتە.
٧- ئاوباریک: ئاواییەکە لە دەڤەری گەرمیانی کەرکووک.

## بێجگە مەندووبی وەزیری

بێجگە مەندووبی وەزیری هەم بابانی کەمە
بۆ سەرۆکی کوردەواری دڵ لەوان خاتر جەمە
نەك سەفیری پادشاهی ئێرسە بۆ بابانییان
حەو سەدەی مێژوو ببینی تێدەگەی لەم واتەمە
تۆ لە فەیرووز قوباد[1] و شاهی ساسان بێرەخوار
میر مرادو میر بوداغ و بەدرخانی سەرهەمە
پشتی تەیموور هێندە زۆرە نایەتە نووسەر ژومار
گەر بە ئێرسی بێ سەرۆکی بۆ ئەوان شاهی جەمە
غەزنەوی مەحموودی[2]، بۆ ئەحمەدەکەی[3] کوردی نەبوو
ئەحمەد و مەحموودی[4] بابانی لە غەزنەوی بێ شەمە
شەش سەدەی هیجری تەماشاکە چلۆن هێناویە
بەگ لە سەر بەگ میری میران خێو سوپاهو هەمهەمە[5]
بەینی ئاوی بادینان و هەم دیالەو جاخەتوو[6]
خاکەکەی بابانییە، بابانییە بێ زەمزەمە
جەنگجۆو[7] لەشکر لە کۆ بۆ دوژمنی بێ تانو پۆ
بادینانو خاکی کۆ بابانییە بۆ سەرهەمە
(نەوحی) بەحری ئەتڵەسی تاریفی بابانی نییە
گوێڵێ ئاوت دایە بەرچاو سەد بڵێی هێشتا کەمە

١– فەیرووز قوباد: کوڕی محەممەد بەگی حاکمی دەرەتەنگ بووە، لە وڵاتی خۆیدا بەسەر بەخۆییەکی تەواو ژیاوە، هاوچەرخی شەرەفخانی بدلیسی بووە، لە جێگایەکی تریش ناوی هاتووە.

٢– مەحموودی غەزنەوی: لە گەورەترین پاتشایانی زنجیرەی غەزنەویانە لە ئێراندا. هیندستانی گرت و بتەکانی سومناتی تەفروتونا کرد. فیردەوسی شانامەی بۆ ئەم نووسیوەتەوە. لە ساڵی (١٠٣٠ن) کۆچی دوایی کردووە.

٣– ئەحمەد: مەبەست لە ئەحمەد موختاری بابانە.

٤– مەحموود بابانی: ناودارێکی کوردە لە بنەماڵەی بابان لە (١٩٥٨/٣/٣ تا ١٩٥٨/٧/١٤ن) لە سەردەمی پاشایەتی ئێراقدا وەزیری بێ پۆست بووە.

٥– هەمهەمە: هەراو هوریا.

٦– ئاوی جاخەتوو: ئەم ئاوە چەمێکە لە دەڤەری شاری (سەقز) لە کوردستانی خۆرهەڵات، لەو شیعرەشدا ناوی هاتووە کە دەربارەی سەقز وتویەتی بە ناونیشانی تەمەن بێت و درێژ بێت و ببینم.

٧– جەنگجۆ: نەترس، سوارچاك.

## مێژووی بناغەی بابا ئەردەڵان

کوردەکان ئێستە بابانی[١] یەکن
ئەردەڵانی و هەم بابانی یەکن
پشتکۆو[٢] سۆرانی و هەم موکریانی
لە قوبادەکەی ساسانی یەکن
لە شەشسەدو سی هیجری بناغەی
ئەم چوار تیرەیە هاوانی یەکن
فەیرووز خۆی ناونا قوبادی ساسان
بە پیرۆزی بێ شایانی یەکن
شەشسەدو پەنجاو شەش بوو هۆلاکۆ
گەیشتە عێراق بەیانی ئەکەین
بابای زیاد کرد لەسەر ساسانیش
روتبەی گەورەیی بۆ شانی ئەکەین
(یەشموت)[٣]یش پێی وت بابا ئەردەڵان
دۆستی لەمەودوا بەیانی ئەکەین
یانی پیاوێکی نێرو گوستاخە[٤]
بۆ تێگەیشتن بەیانی ئەکەین
بابا ئەردەڵان بوو بە لەقەبی
تا وەختێ کە مرد بەیانی ئەکەین
شەشسەدو هەشتاو پێنجی هیجری بوو
ئێستە شیوەنی، بەیانی ئەکەین
زەمانە رایدا تا بە (تەیموور خان)[٥]
نۆسەدو هەشتاو شەشی هیجری بوو
(تەیموور) پێگەیی و بوو بە حوکمران

١– بابان:ماڵەباب، باوان.
٢– پشتکۆ: زنجیرە چیایەکە لە ئارارات‌ەوە درێژ دەبێتەوە تا کەنداوی فارس.
٣– یەشمووت: کوڕی هۆلاکۆیە.
٤– گوستاخ: ئازاو چاونەترس.
٥– تەیموور خان: کوڕی سوڵتان عەلی کوڕی سورخابە. لە ساڵی (٩٨٦ک) بەرامبەر بە (١٥٨٠ز) سوڵتان مورادای عوسمانی خستویەتیە ریزی میری میرانەوە و بووە بە تەیموور خانی پاشا.

بە سەرینی خۆی چوار کوڕی هەبوو
ئەوان ئەمیرو خۆی میری میران
یەك (سولّتان عەلی)[1] دووەم (میر بوداغ)
سێیەم (میر مراد) ، چوارەم (بەدرخان)
لەو دەمەدا بوو خەلّکی شارەزوور
کرایە دوو بەش دوو ناوی لێنان
(تەیموور خان پاشا) ناوی باپیری
لەتکرد بەشی کرد وەکو موڵکەکان
بەشی ئەم سیانەی ناونا بە بابان
میر مرادو بوداغ و بەدرخان
سولّتان عەلیش لەگەلّ موڵکەکەی
پارێزرا ناوی نا بە ئەردەلآن
تەیموور خان دەرسی بیری خوێندبوو
بۆ پاشەڕۆژە بۆ خۆشی ژیان
خستییە عالەمی سیاسییەوە
هەر چوار کوڕەکەی لە ڕۆم و ئێران
(نەوحی) بە کوردی ئەم باسە خۆشەی
لە مێژوو هێنا بۆ خوێندەواران

١– کوڕی تەیموور خانی ئەردەلآنییە (نەوحی ئەم زانیاریانەی لە شەرەفنامەی بدلیسییەوە، بەدەستهێناوە).

# نەورۆزنامە[1]

مێژووی ساڵ هیجری پیرۆز و جوانە
هەزارو سێسەد، هەفتاو سییانە
مێژووی کوردییە ڕێککەوتی ئەوە
چوار هەزارو دوو، سەدو چلیانە
لەو ڕۆژەوەیە (حەموراب) کوژرا
تاریخ و مێژووی نەورۆژمانە
دوو هەزارو دوو سەدو هەشتاو شەش
لە پێش میلادی (عیساوی)یانە
نەورۆزی ئێمە مەجووسی نییە
یاخۆ سوڵتانی و ئێرانییانە
نەورۆزی ئێمە پیرۆزانەیە
ئازادی لە دەس حەمورابیانە
بۆ کوردەواری پیرۆزە نەورۆز
هەموو بزانن کە جەژنمانە
ئێمە مەجووسی و ئاگر پەرست نین
نەورۆزی ئەوان بە جیا بزانە
ئێمە کە کوردین ئیسلامی ئایین
وتاری خووا قورئانمانە
جمعە بۆ ئێمە ڕۆژی وچانە
بازاڕمان ناوێ بێزاریمانە
چل و دوو سەدەی تێپەڕاندووە
هەرمێ پشکوان سەری ساڵمانە
مەجووسی لە کوێ؟ ئێرانی لە کوێ؟
چەند سەدەیەکە لە پێش ئەوانە
مەلا لە خۆتۆ بۆ فەتوا ئەدەی؟

١– نەوحی ئەم شیعرەی لە سەردەمێکدا هۆنیوەتەوە کە هەندێ لە کۆلکە مەلاکانی گوندنشینەکان دژ بەو لاوە خوێن گەرمانە ڕاوەستاونەتەوە کە ئاگری نەورۆزیان بە پیرۆز زانیوە و وەك مەشخەڵ لە سەربان و گرد و تەپۆڵکە و هەردەکانی گەرمیانی کوردستان کردووەتەوە و لەو ڕۆژە نوێیەدا، دەستیان ناوەتە ناو دەستی یەك و جەژنە پیرۆزەیان لەگەڵ یەکتردا کردووە. ئەم شیعرەمان لە ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (١١٧١)ی ڕۆژی (١٩٩٠/٤/١٩)ن بڵاوکردووەتەوە.

بۆ پەکی ئەخەی ئەم پاوو دانە
چ زیانێکی بە ئایین هەیە ؟
نیشانەی ڕۆژی ئازادیمانە
بژی ئەو کەسەی ئێوارەی نەورۆز
گڕی ئاگری وا لە سەربانە
ئەو نەورۆزەی وا کە شەرع نایەوێ
ئاگر پەرستی‌و مەجووسییانە
نە وادە یەکە نە مێژوو یەکە
نەورۆزی ئێمە لە پێش بزانە
(نەوحی) ئەوانەی کە مێژوو زانن
مەعلوومە لایان ئەم نەوڕۆژانە

## جەژنی نەورۆز

نەورۆزی دووهەم هەیە لەوساوە
زوحاك كوژرا بە چەكوش (كاوە)
دوو هەزارو دوو سەدو هەفتاو شەش
ئەم لەم ڕۆژەیە بۆ ئێمە باوە
چونکە شەشسەدو دوانزە ساڵ لە پێش
میلادی مێژووی کاوە تەواوە
سڵاوی شۆڕشگێڕانەی ئازا
لەبۆ ئەو کەسەی پێشمەرگەی ناوە
وا گیان بەخت ئەکا لە ڕێی کوردستان
خەنجەری دەستی وا تازە ساوە
گڕی ئاگری نەورۆزی ئێمە
جەرگی دوژمنی سووتان وەك قاوە
ئیتر با بژی پارتی نەبەزمان
بە دیموکراتی لە هەموو لاوە
بۆ سەرکردەیی، (مستەفای بارزان)
بژی کوردستان وەك کاتی کاوە

## تاڵەبانی بەو هەموو بیرو هونەریا

تاڵەبانی[1] بەو هەموو بیرو هونەریا بۆتەوە
تیرەیەکە ئەو لە هۆزی زەنگنە جیا بۆتەوە
پیر مەلا مەحموودی[2] زەنگنە شێخی هیندی کردیە شێخ
ئێستە هۆزێکە بە شێخی ناوی وا جیا بۆتەوە
خۆ نەژادو بن تەمەڵ ئەو زەنگنەیەو زەنگنە ژیان
میر سمایل[3] کیژی دایێ چۆن ئیتر جیا بۆتەوە

---

١– تاڵەبانی بنەماڵەیەکی کوردن و دەگەڕێنەوە سەر هۆزی زەنگنە، لە کەرکووك و دەوروبەریدا نیشتەجێن.

٢– پیر مەلا مەحموود: ئەم زاتە کوڕی یوسف زەنگنەیە، لە ساڵی (١١٣٠ك) بەرامبەر بە ساڵی (١٧١٨) لە (قەرەداغ) لەدایك بووە. لە کاتی خۆیدا بەرێوەبەری میری ئەو سەردەمە بووە بە پلەی کارمەند. ژنەکەی کچی میر سمایل زەنگنەیە و لەم ژنە، دوو کوڕی بە ناوەکانی (مەلامحەممەد) و (شێخ ئەحمەد)ەوە بووە. مەلا مەحموود لە پاش تەواوکردنی خوێندن و وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی، لە قەرەداغ دەگوێزێتەوە بۆ ئاوایی (ڕەمەزان مامکە) و لەوێ بووەتە مەلا و ساڵی (١٨١٥ز) هەر لەوێ ئەمری خوای کردووە. لە دوای خۆی شێخ ئەحمەدی کوڕی (١٧٨٠–١٨٤١ز) جێگای دەگرێتەوە و لە دەوروبەری ساڵی (١٨٢٠ز) ماڵ بۆ ئاوایی (تاڵەبان) لە دەڤەری (چەمچەماڵ) دەگوێزێتەوە و تەکیەیەکی بۆ خۆی دروست کردووە و گەلێ دەروێشی لە دەور خۆ کۆکردووەتەوە و لەسەر ڕێبازی قادری ڕۆیشتووە. ئەم مەلا ئەحمەدە دە کوڕی هەبووە و نەوەکانیشی بە ناوی ئەو گوندەوە ناسراون. وا دەگێڕنەوە شێخ مەحموود شێخێکی ئایینی پایە بەرزی هیندی ئیجازەی شێخێتی داوەتێ.

٣– میر سمایل: ئەم زاتە کوڕی نەوشیروان بەگە، بە میر سمایل بەگی زەنگنە ناوبانگی دەرکردووە. خەڵکی ئاوایی (قەیتوول) بووە لە دەڤەری گەرمیانی کەرکووکدا. میر سمایل پیاوێکی زلناو وریا و ئەدەب دۆست، ئازا و چاو نەترس بووە. لە سەردەمی سوڵتان موورادی سێیەمدا لە ئاوایی (قەیتوول)ی سەر بە شارۆچکەی (قادر کەرەم) ئیمارەتێکی پێك هێناوە و خۆیشی بووە بە میری ئەو ئیمارەتە، نزیکەی چل ساڵێك حوکمی کردووە. میر سمایل لەگەڵ ئایشە خانی کچی شێخ مستەفای سەرگەڵو، زەماوەندی گێڕاوە و سێ کوڕی بە ناوەکانی (ئەحمەد بەگ) و (محەممەد بەگ) و (عەبدولڕەحمان بەگ) بووە. لە بواری ئەدەب و شیعردا کاری کردووە، دەستی شیعرنووسینیشی هەبووە. دەستەی شاعیران و ڕۆشنبیرانی خۆش ویستووە. کە ئایشە خانی ژنی دەمرێت، زۆر خەمبار و ناڕەحەت دەبێت؟ چونکە پڕ بەدڵ خۆشی ویستووە و زۆریش هۆشیار و زرنگ و جوان و خانومان بووە. شاعیرێك لە شاعیرانی ئەو ڕۆژگارەی هۆزەکەی کە بەمە دەزانێت، لە پارچە شیعرێکدا دڵی میر سمایل دەدلتەوە و دەڵێت:

میر سمایل وە خەم.. میر سمایل وە خەم
بە عەشق شای شاهان وێت مەدەر وە خەم
سەر بکێش وە دیار زایەڵە و حەرەم
ماچان چە باخچەت گوڵێ بییەن کەم
سەر تۆ خۆش بۆ وە قەندیل کۆوە
نە جای ئاگوڵە سەد گوڵ مەبۆوە

میر سمایلیش لە وەڵامدا دەڵێت:

گوڵ من گوڵ نەوی شا پەسەنی بی
ئەسڵش بەگزادەی شا حەسەنی بی
قرمزی گوڵ ڕەنگ نە باغان نەدیم
یاسەمەن نە بورج ئێلاخان نەدیم

تاڵەبانی بۆ وتارو زەنگنە لەبۆ ڕەزمگا[1]
با بڕێ ئەم دوو نەبڕە وا لەیەك جیا بۆتەوە
پیر مەلا مەحموود دێیەکەی تەکیەی لەناو زەنگنە
پارچەێکە ئەو لە دێی بەگزادەدا جیا بۆتەوە
کاتێ شێخی هیندی بانگی شێخیەتی بۆدا لە کورد
بوو بە قوتبی عاریفان و گۆی لەوێ بردۆتەوە
دەستەیە دەروێشی هەمەوەند[2] بردیانە ناو خۆیان
(تاڵەبان)ی کردە تەکیە جێگەیی تیا بۆتەوە
تاڵەبانە تالۆ[3] واوی، تالۆو گیایە، دیارییە
حەزرەتی شێخیش لەوێدا شوهرەتی کردۆتەوە
یەکە تازو[4] هەڵبژێراوە هەوێنی گەوهەرە
شێخ ئەوڕەحمانە[5] لە پاش ئەو شێخ عەلی[1] جیا بۆتەوە

---

بڕوانە (هەڵبژاردەیەك لە هۆنراوەی فۆلکلۆری – ناوچەی گەرمیان – هـ. ك / ١٩٨٥) کە بەشێك لە ئەم شیعرە، لە ئەوێدا بڵاوکراوەتەوە.

١– ڕەزمگا: مەیدانی شەڕ، واتە: تاڵەبانی بۆ وتار و وتووێژ، زەنگنەش بۆ سوارچاکیی و شەڕ لەگەڵ دوژمندا.

٢– هەمەوەند: هۆزێکی بەناوبانگی کوردە، بە زۆری لە ناوچەی چەمچەماڵ و دەوروبەریدا نیشتەجێن.

٣– تالۆ: تالك، جۆرە ڕووەکێکی خۆڕسکییە، گوندی تاڵەبان بە ناوی ئەم گیایەوە ناونراوە؟ چونکە لە دەوروبەریدا، لەم ڕووەکە زۆرە. واوی: هەمیسان، سەرلەنوێ.

٤– یەکەتاز: سوارێکی ئازا کە بە تەنیا دەچێ بەگژ دوژمندا.

٥– شێخ ئەوڕەحمان: کوڕی مەلا ئەحمەدی مەلا مەحموودی زەنگنەیە. لەساڵی (١٧٩٧ز) لە ئاوایی (قرخ) لە ناوچەی چەمچەماڵ لەدایك بووە. پیاوێکی بە ئایین و میوان دۆست و چاو تێر بووە. دەستی شیعر نووسینی هەبووە، زۆربەی شیعرەکانی بە زمانی فارسی داناوە. جارێکیان کە بۆ حەج دەچێت، تا دەگاتە بەغدا، هەموو خواردن و پارە و پوولەکەی دابەش دەکاتە سەر هەژاران و لەوێ دەچێتە زیارەتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧–١١٦٥ز)، لە دوای زیارەتکردن ئەم شیعرە دەڵێت کە لە شێخ عەلی تاڵەبانی (١٩٢٩– ٢٨/١٢/١٩٩٠ز)ـەوە وەرگیراوە:

بولچـان حاجیـان نەکێـشان جـەفا
نەکێـشان جـەفای ڕای مـەرواو سـەفا
بـەیان تـەواف کـەن بـەر ئاسـتانەکەت
سـەر بـسان وە خـاك، دەور بـەر یانەکـەت

نووسەر شێخ حوسێن عومەر بەرزنجیش دەڵێ: من بەم جۆرەش گوێم لێ بووە:

باچـنە حاجیـان نەکێـشان جـەفا
نەکێـشان جـەفای ڕای مـەروەو سـەفا
بـەیان تـەواف کـەن دەور یانەکـەش
هوێـشان بـساون چـە ئاسـانەکەش

خانەقی و هەولێر و کەرکووك و گل و کفری نەوەی[2]
ئەو مەلا مەحموودەنە بۆیە کەوا جیا بۆتەوە
(نەوحی) بەسیە تۆ ئیتر مێژوو ئەنووسی باوتە
زەنگنە سەدان پیاوی بەرزی وا لە ئەو جیا بۆتەوە

شێخ عەبدولرەحمان پێنج کوڕی لە پاش بەجێ ماوە (شێخ عەلی، شێخ عەبدولقادر "فائیز"، شێخ عەبدولواحید، شێخ ڕەزای شاعیر، شێخ حەسەن). لە ساڵی (١٨٥٨ز) فەرمانی یەزدانی بەجێ هێناوە و لە کەرکووك لە تەکیەی ئەحمەدی باوکیدا کە بە تەکیەی تاڵەبانی ناسراوە، بە خاك سپێردراوە.

١– شێخ عەلی ١٨٣٢– ١٩١٢ز: کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا مەحموودە.

٢– واتە: تاڵەبانییەکان لەم شوێنانەدا نیشتەجێن (خانەقی، هەولێر، کەرکووك، بناری گل، کفری).

# میرێکی زەنگنە

هەزار و سەد و چل ساڵی هیجری
ئەمیری کوردی زەنگنە لە بەری
خزم و کەسانی کرماشانیان
کرماشانیان گرت خۆی چووە سەری
ئەوەڵ سەرداری سوپای نادر[1] بوو
بە پێنج هەزار سوار زەنگنە دەرپەڕی
ڕوو بە کێوانی کرماشان ڕۆیی
قەڵاکەی گرتو لەوەش دەرپەڕی
جەنابی ئەمیر (حوسێن قولی خان)[2]
حوکمی ڕەوا بوو تا ئەلەشتەری[3]
بەڵام کەڵوڕیش[4] پشتیوانی بوو
بەبێ کەڵوڕیش خۆی چووە سەری
کەڵوڕیش بۆ خۆی حوکمڕانی بوو
ئەمیرێکی بوو ئەویش تێپەڕی
وەختە ئێستاکی پەرتەوازە بین
بین گیرۆدەی داوی سەرسەری
وتەی (نەوحی)یە لە مێژوو دەرچوو
کەسێ مێشکی بێ ئەیکاتە بەری

---

١– نادرشا ١٦٨٨–١٧٤٧ز: لە مشهەد لە دایك بووە و لە فەتح ئاباد ئەمری خوای کردووە. پاتشای ئێران بووە.

٢– حوسێن قولی خان: سەردارێکی کورد بووە لە سوپای نادر شادا، لە پاشاندا لێی هەڵگەڕاوەتەوە و بە پێنج هەزار سواری زەنگنەوە لە دەڤەری کرماشان دژ بە نادر شاو ڕژێمەکەی ڕاوەستاوەتەوە و بووە بە ئەمیری ئەو ناوچەیە.

٣– ئەلەشتەر: شارێکە لە خۆرهەڵاتی لوڕستان لە ئێراندا.

٤– کەلوڕ: کەڵهوڕ، شێوەزارێکی کوردی ڕەسەنە، بە زۆری لە کوردستانی خۆرهەڵات نیشتەجێن، هەندێکیشیان لە کوردستانی باشوور لە خانەقیی و مەندەلیی و قەزانییە و بەدرەوجەسان و کووت نیشتەجێن، ئەوانیش زۆرجار میرنشین بوونە.

## کوانێ قوتبی عاریفان

کـــــوانێ قـــــوتبی عاریفـــــانی یەککـــــەتا؟
کـــــوا (عـــــەلی)[1] خـــــەوواس‌و شـــــاهی ئـــــەولیا؟
کـــــوانێ غـــــەوس قـــــەرەنی[2] چـــــواردەی هیجرەتـــــی؟
کـــــوا خەلیفـــــەی شـــــاهی پـــــاکی ئـــــەنبیا؟
کـــــوا (حیـــــسامەددین عـــــەلی) ڕۆڵـــــەی بـــــەها؟
کـــــوا حـــــەبیب‌و خۆشەویـــــستی ئەســـــفیا[3]؟
ئافەریـــــدەی[4] دەهـــــرو[5] مـــــەحبووبی دڵان
کـــــوانێ فـــــەردو یەککـــــەتازی ئەســـــفیا؟
کـــــوا پزیـــــشکی دەردی دڵ بـــــۆ کوردەکـــــان؟
دیـــــاری یـــــو پـــــەنهان، ســـــەرۆکی ئـــــەولیا
یـــــەك هـــــەزارو دووســـــەدو هـــــەفتاو هەشـــــت[6]
هاتـــــە دنیـــــاوە لـــــە شـــــەرعیدا ژییـــــا
بـــــۆ شـــــەریتی نیـــــسبەتی داوی جـــــەلا[7]
نەقـــــشی ڕۆحیـــــدا لـــــە دڵ وەك کـــــەهرەبا
تـــــا بـــــە هەشـــــتا ئـــــەو لـــــە بـــــەحری شـــــەریعەت
کەشـــــتییانی دوو تەریقـــــەت[8] بـــــوو لـــــە دوا

---

١– عەلی: ئەم زاتە کوڕی شێخ محەممەدی بەهائەددینە، بە شێخ حیسامەددینی تەوێڵە بەناوبانگە. لە ساڵی (١٢٧٨ك) بەرامبەر بە (١٨٦١ز) لە تەوێڵە لە دایك بووە. ئەم ناودارە لە ژیانی باوکیدا قورئانی پیرۆزی لەبەر کردووە و پاشان دەستی کردووە بە خوێندنی وردە کتێبەکان (نەحوو، سەرف). لە سەرەتای هەرزەکاریدا تەریقەتی لە سەر دەستی باوکیا وەرگرتووە. پاش مردنی باوکی، لە جێی ئەو دانراوە لە خانەقای تەوێڵە. زانایەکی ئایین پەروەر و خواپەرستێکی ڕاستەقینە بووە. قسەزان و ڕووخۆش، پایەی کۆمەڵایەتی بەرزبووە و لەناو مورید و مەنسووبەکانیشیدا گەورە و بەڕێز بووە. لە بەهاری ساڵی (١٣٥٨ك) بەرامبەر بە (١٩٣٩ز) لە باخەکۆن کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێیش لە ژوورێکدا بە خاك سپێردراوە. نەوحی لە ساڵی (١٩٢٨ز) لای ئەم زاتە تەریقەتی وەرگرتووە و گەلێ خۆشی ویستووە، بۆیە ئەم چامە شیعرییەی بە بۆنەی کۆچ کردنیەوە دلناوە. لە چەند شوێنێکی تریشدا ناوی هێناوە.

٢– غەوس قەرەنی: وەیس قەرەنی ماهیدەشتی، یەکێك بووە لە ئایینداو و باوەڕ بە هێزانی سەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە ناو کوردا. گوایە لە چۆڵ و بیاباندا ژیاوە، لە ناو کوردەواریدا وەك وەلی سەیری دەکرێت و پایەیەکی بەرزی هەیە. لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا لە ساڵی (٣٧ك)دا مردووە.

٣– ئەسفیا: خاوێنەکان، چاکان، هەڵبژاردەکان.

٤– ئافەریدە: سازندە.

٥– دەهر: ڕۆژگار، زەمانە.

٦– (١٢٧٨ك) مێژووی لە دایك بوونی شێخ حیسامەددینە.

٧– جەلا: ڕوون و ئاشکرا، ئاشکرا بوونی هەر شتێك.

٨– تەریقەت: ڕێباز، ڕێبازی سۆفیگەرێتی.

تا بە هەزارو سێسەدو پەنجاو هەشت
تەپڵی کۆچی کۆسی خستە سەر دڵا
ئەی خوا سۆزەی نەسیمی نیسبەتی
با بە ڕۆحا بێتە ناو هەردەی دڵا
حوببی ئەو زاتە یەقین وەك کەهرەبا
بۆ ئیزاعەی هیممەتی ئەهلی دڵا
باغەکۆن کابەی نیازی عالەمە
جا لەبۆ (نەوحی) وەکو مەروەو سەفا

## شینی حاجی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری[1]

لەسەر بەرگێکی کوردی بوو شەهید بوو شێخ عوبەیدوڵلا
لەسەر ئاوو هەواو خاکی وەتەن بوو وای کە پێکریا
کەسێ شێخ بێتو حاجی بێ شەجیعو هەم موسەققەف بێ
شەهیدی بەختی کوردی بێ ئەوە کێیە عوبەیدوڵلا
نەژادو خانەدانی ئەو ئەمینی دینو کوردانن
براو ئەولادی ئەو بەرزێن بە ئاینی عوبەیدوڵلا
کەس نابێ کە هیچی تر بڵێ جگە لە خەفەت خواردن
هەزاران جەبری خوێنی ئەو بکا هێشتا کەمە لێرا
برای زۆرە کوڕی زۆرە هەموو هاوشانی بیری ئەو
هەموو ئازاو زاناو کورد، هەموو گەنجی وەتەن ئارا
لە سیانزەی عەسرو نیوەی هیجریا بوو کۆچی پێچاوە
لە پاداشتی دڵی کوردە بەهەشتی پێ ڕەوا دریا
کە چەندە نیشتیمانی ئەو بەبێ دڵسۆزە ئەی یەزدان
(فأنت معطي الفضل لمن أدنى به الاولى)[2]
هیوای فێنکی دڵی کوردە کە (نەوحی) ئەو بنەماڵە
گەلێ گوردو شەجیعی هەن وەکو حاجی عوبەیدوڵلا

---

١- شێخ عوبەیدوڵلای نەهری شەمزینی (١٨٣٠-١٨٨٣ز): ڕابەرو پێشەوایەکی کوردی مەزنە. ساڵی (١٨٨٠ز)دا بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردستان لە ئێراندا شۆڕشێکی گەورەی بەرپاکرد، لە ڕۆژی (١٨٨٢/١٠/٢١ز) دەوڵەتی تورکیا بە لەشکرێکی زۆرەوە هێرشیان کردە سەر و بەدیل گرتیان و ڕەوانەی وڵاتی سعوودیەیان کرد. لە شاری مەدینە کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی (موعەللا)ی مەککە سپاردەی خاك کراوە. بۆ بەدەستهێنانی زانیاری زۆر دەربارەی خۆی و شۆڕشەکەی، بڕوانە کتێبی (شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری، محەممەد حەمە باقی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٠).

٢- ئەم نیو باڵە، بە زمانی عەرەبی دایڕێژاوە ئەمەش واتاکەیەتی (خوایە، بۆ ئەوانەی لە خۆت خوارترن، هەر خۆت خاوەنی پاداشت و چاکەیت).

# شیوەن بۆ شێخ مەحموودی نەمر[1]

شکا پشتو، بڕا جەرگی هەموو کورد
بە ئەو دەنگەی لە ناکاوا دەستو برد
جیهانی تێکەیاندو خستییە لەرزە
سبەی سێشەممە ڕۆژی چواری مەولوود
کزەی جەرگو قژەی دڵ ماوە نادا
بڵێم دایاخی[2] کوردم ڕۆیی ئەی کورد
شڵەژرا ئاسمانی کوردی بەدبەخت
شەماڵ شاباشی گیانی (شاهی مەحموود)
تەمی غەم گێژەڵۆکەی ڕۆژی ناشاد
لە کەس با هەڵنەکا ئەمڕۆ وەکو کورد
ئیتر کوردە بناڵێنن بگرین
لەگەڵ ژینی خۆیا ژین ئێمەشی برد
بە مەرگی غەم بەجێ مابوو بە مێژوو
هەزارو سێسەدو حەفتاوو شەش مرد
ئیتر (نەوحی) بە خوێنی چاو بنووسە
بژیوێ کوا، سەرۆکی کا لەبۆ کورد؟
بپرژێنە خوا ئاوی سەبووری
بە سەر کوردا لە گەورە تا وەکو ورد
بڕینی شێخی بارزانی[3] بەسۆیە
ئەمیشی هاتە لا هانایە ئەی کورد
پزیشکی هەڵخەڵەتاوی وەسی[4] بوو
ئەوی کوشتو[5] ئەمی گرتو[6] ئەوی برد[7]

---

١- شاعیر ئەم پارچە شیعرەی لە لاولاندنەوەی شێخ مەحموودی حەفیدا (١٨٨٢-١٩٥٦ز) وتووە کە لە ساڵی (١٣٧٦ك) بەرامبەر بە (١٩٥٦ز) ئەمری خوای کردووە، ساڵی مردنی بە حیسابی ئەبجەد (بە مەرگی غەم بەجێ مابوو)، بە مەرجێ کە بە ڕێنووسی کۆن بنووسرێت (بمرگی غم بجی مابو) کە دەبێتە: ب= ٢ + م= ٤٠ + ر= ٢٠٠ + گ= ٢٠ + ی= ١٠ + غ= ١٠٠ + م= ٤٠ + ب= ٢ + ج= ٣ + ی= ١٠ + م= ٤٠ + أ= ١ + ب= ٢ + و= ٦ کە هەمووی ئەکاتە (١٣٧٦ك) کە شێخی تێدا مردووە. شێخ مەحموود لە ساڵی (١٩١٩ز) بۆ ماوەی دوو هەفتە بووە بە مەلیك.

٢- دایاخ: پشتیوان، دڵسۆز.

٣- شێخی بارزانی: شێخ سەلام بارزانی، برا گەورەی خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای بارزانییە، لە ساڵی (١٩١٤ز) عوسمانییەکان لە مووسڵ لەسەر کوردایەتی لە سێدارەیان دا.

٤- وەسی: عەبدولئیلا کوڕی مەلیك عەلی حوسێنە، خاڵۆی مەلیك فەیسەڵی دووەمە؛ لەبەر ئەوەی مەلیك منداڵ بووە، ئەم کاروباری دەوڵەتی بە ڕێوە دەبرد و سەرپەرشتی مەلیکی دەکرد. لە پاش شۆڕشی (١٤/٧/١٩٥٨) لەگەڵ بنەماڵەی مەلیکدا، کوژرا.

٥- مەبەست لە شێخ سەعیدی پیرانە. ٦- مەبەست لە شێخ مەحموودی نەمرە. ٧- مەبەست لە مەلا مستەفای بارزانییە.

## شیوەنی حەمە بەگی[1] فەتاح بەگی جاف

فەلەك پەرگاری نایە جەرگی كوردان
لەون قەترانی بوو بەرگی زویران
ئەوا لافاوی فرمێسك و چەمی خوێن
لە دیدەی كورد دەچۆڕێ تا بە گۆران
گوردی كوردو سەمای جافە كە ماتە
سورەبیا عەقد[2] ئەڕێژێ وەك باران
كەژو كێوو كەلارو[3] دەشتی شاكەل[4]
هەموو وشك و سیاپۆشە[5] لە گریان
فریشتە دەستی ئەی وایدا[6] بە سەردا
لە دەستی چەرخی گەردوون جەوری دەوران
محەممەد بەگ لە نەسڵی[7] شاهی جافان
سەفەر بوو، بۆ سەفەر چوو كۆچی یاران
لە سەقف و سەتح و جەم و جەوهەری كورد
عەرزرێژانە كە (نەوحی) كرد حەیران
لەوانە تاكە گیانی دەرچوو ڕۆیی
بە سەیرانی بەهەشت و باغی ڕیزوان
بە مێژووی كۆچی ئەو كاتێ كە ڕۆیی
(زەهی غیفران)[8] بە گیانی چەشنی یاران

---

١- حەمە بەگ (١٩٠٤-١٩٣٤ز) كوڕی فەتاح بەگی جافە، ناودارێكی ناسراوی هۆزی جاف و نەتەوەی كوردە، بۆ یەكەمجار ئەم قوتابخانەی لە ئاوایی كەلاری كۆندا دامەزراندووە.

٢- سورەبیا عەقد: كۆمەڵە ئەستێرەیەكە لە شێوەی ملوانكە. واتە: ئەو كۆمەڵە ئەستێرەیەش بۆ مەرگی حەمە بەگ دەگرین.

٣- كەلار: شارۆچكەیەكە سەر بە شاری كەركووك.

٤- دەشتی شاكەل: شاكەل گوندێكە لە دەڤەری كەلار.

٥- سیاپۆش: ڕەش پۆش.

٦- وای: وشەی داد لە ژان یان مردن.

٧- نەسڵ: نەوە، وەچە.

٨- زەهی غیفران: بە ڕێنووسی كۆن و بە حیسابی ئەبجەدی دەكاتە (١٣٥٢ك) بەرامبەر بە (١٩٣٤ز) كە ساڵی مردنەكەیەتی بە مەرجێ بەم جۆرە بنووسرێت (زهی غفران) وەك: ز= ٧ + ه= ٥ + ی= ١٠ + غ= ١٠٠٠ + ف= ٨٠ + ر= ٢٠٠ + أ= ١ + ن= ٥٠ كە هەمووی دەكاتە (١٣٥٣ك).

## شیوەن بۆ کەریم بەگی جاف[1]

هەورەکەی نەگبەت هاتەوە دیسان
غەم ئەبارێنێ بۆ کورد و گۆران
زەلزەلەی قەزا کەوتە لیواوە
بوومەلەرزەیە لە بۆ نیشتیمان
کفریو[2] قەرەغان[3] شێروانەو[4] شاکەل[5]
لە چەمەرانو[6] شیوەن و گریان
ئەو ئوتۆمبیلە یەک لە دوای یەک
بۆ کش و ماتە هەموو بە یەک سان
لاشەی کەریم بەگ فەتاح بەگی جاف
ئەبا بۆ کەلار ئەمجا بۆ قەبران
شار و دێهاتی کورد و جافەکان
ریزیان پێکاوە هەموو قوڕ بەشان
ئێوارە بە ڕۆژوو بوو لە بەر بانگ
چەن ڕۆژێ لە پێش جەژنی ڕەمەزان
گیانی لە ژینا ڕۆیی بۆ بەهەشت
غەمی بەجێ هێشت بۆ کوردو گۆران
لاشەی گەوهەری سەدەف کۆیە
گۆڕخانەی شاهی سەیید خەلیلان[7]
لەو خاکە پاکە تەنشتی کەلار
جێگەی شوهەداو گەورەی کوردەکان
باب و باپیری سەرۆک و پاشان

---

١– کەریم بەگ کوڕی فەتاح بەگی حەمە پاشای سەرۆکی جافە (١٨٨٩–١٩٤٩/٧/١ن). ناودارێکی ناسراوی هۆزی جاف و تێکڕای کوردە، خەڵکی کەلارە لە دەڤەری گەرمیانی کەرکوکدا.
٢– کفری: شارۆچکەیەکە سەر بە شاری کەرکووك.
٣– قەرەغان (قەرەخان): جەلەولا، شارۆچکەیەکە سەر بە پارێزگای دیالە.
٤– شێروانە: ناوی دەشتێکە لە دەڤەری کەلار.
٥– شاکەل: گوندێکە سەر بە شارۆچکەی کەلارە.
٦– چەمەر: چەمەری، شین و شەپۆڕ.
٧– گۆڕخانەی سەیید خەلیل: گۆڕستانی سەیید خەلیل کە لە نزیك شارۆچکەی کەلارەوەیە، کەریم بەگ لەوێ بە خاك سپێردراوە.

بـــه وێنـــەی (بابـــان) لـــە بـــۆ کوردســـتان

(داود بـــەگ)[1] بـــرا بـــچووکی ئـــەوە

مەنـــدووبی کـــوردە بـــا بـــژی بۆمـــان

ئەرشـــەدی[2] کـــوڕی کـــەریم بـــەگ کێیـــە ؟

محەممـــەد ئـــەمین[3]، موســـتەفا[4] بـــەگیان

هـــەلگرە مێـــژوو (بـــۆ خەفـــەت کـــوردن)[5]

بـــۆ بانـــەڕۆژە بـــۆ کـــوردەواران

هـــەزارو سێـــسەدو لەگـــەڵ شەســـت و هەشـــت[6]

مێـــژووی مردنیـــە (نـــەوحی) بـــۆی دانـــان

---

١- داود بەگ (١٩٠٥-١٩٦٦ز): کوڕی فەتاح بەگی جافە، سەرۆکی هۆزی جاف و ناودارێکی ناسراوی کوردی دەڤەری گەرمیانە، بۆ چەند جارێکیش بووەتە نوێنەری کورد لە پەرلەمانی ئێراق. لە ساڵی (١٩٦٦ز) لە ئێران لە نەخۆشخانەی میهر ئەمری خوای کردووە و تەرمەکەیان هێناوەتەوە بۆ نیشتیمان و لە گۆڕستانی سەیید خەلیل سپاردەی خاک کراوە.

٢- ئەرشەد: لێزانتر، شارەزاتر، واتە: کوڕەکانی کەریم بەگ هەرکامیان شارەزا و لێزانترە با ئەوە ببێتە جێگری و خزمەت بکات.

٣- محەممەد ئەمین (١٩١١- ١٩٦٥ز): کوڕی کەریم بەگی جافە، دەستی شیعر نووسینی هەبووە و نازناوی (مینە جاف بووە)، لە پاش خۆی خوالێخۆشبوو مستەفا نەریمان بەرهەمەکانی لە چاپ داوە.

٤- مستەفا (١٩٢٢-١٩٩٧/٧/٢٩ز): کوڕی کەریم بەگی جافە، لە دوای مردنی باوکی، ئەم لە دیوەخاندا لە شوێنی باوکیدا دانیشت و کاروباری هۆزەکەی بە ڕێوە دەبرد. خۆی و باوکی و براکانی هەمیشە خزمەتگوزار بوون و هەستی نەتەوایەتیان بەرز بووە، بۆیە دەستی یارمەتیی و بازەییان بۆ هەر کوردێکی هەژار و لێقەوما و درێژ کردووە.

٥- بۆ خەفەت کوردن: بە حیسابی ئەبجەدی و بە ڕێنووسی کۆن کە بەم جۆرە بنووسرێت (بو خفت کوردن) مێژووی مردنی کەریم بەگی جافە، کە دەکاتە (١٣٦٨ک) بەرامبەر بە ساڵی (١٩٤٩ز)، لە پێش جەژنی ڕەمەزان بە چەند ڕۆژێک مردووە، حیسابی ئەبجەدەکەش بەم شێوە دەبێت: ب= ٢ + و= ٦ + خ= ٦٠٠ + ف= ٨٠ + ت= ٤٠٠ + ك= ٢٠ + و= ٦ + ر= ٢٠٠ + د= ٤ + ن= ٥٠ کە هەمووی دەکاتە (١٣٦٨ک).

٦- واتە: (١٣٦٨ک) کە ساڵی مردنەکەیەتی.

## شیوەن بۆ شێخ حیسامەددین تەویڵەیی[1]

ئەی تۆبە لە دەست ئاگری دووری لە بەهارە
وەی قوڕ بەسەری بولبولی بێ گوڵ لە نزارە
ئەی خۆزگە بە پارم لە بەهارا گوڵی ڕووم دی
وەی داخی گرانم کە بەدەن وا لە مەزارە
سەد زیندووە دڵ مردووە پێویستە بە جارێ
بۆ نیسبەتی گوڵ لەو بەرو دەربانو دیارە
سا کاکە وەرە شینێ بکەین، شین بکەین با
سۆزەی خەفەتی دڵ لەسەر ئەو خاکو غوبارە
لادەین لە کینایەو[2] لە موعەممای[3] دڵی شاعیر
سەر باسی خەیاڵی گوڵو خاڵی لەبی یارە
کوا شێخی حیسسامی لە بەهار، قوتبی زەمان کوا؟
سوڵتانی وەلی[4] شاهی عەلی[5] وا لە مەزارە
کوا زینەتی بەر چاوو دڵی عالەمی عاشق؟
کوا چاوی پیاڵەی لە هەزار دوو لە هەژارە؟
سەد شوکری خوا هاژەیی نیسبەت وەکو جاران
ڕۆحیانەتی سەبتی[6] دڵی دۆستە کە دیارە
قرچەی دڵو برژەی جگەرو دووکەڵی ئاخم
پەردەی تەمی هێناوە بە سەر یارو نەیارە
وا هەردەی دڵی پۆشی خەفەت ئاگری تێچووە
مەر نیسبەتی ئەو شاهە بکا سەردی دووبارە
گیانو دڵو ماڵت بکە شاباشی مەزاری

---

١- شێخ حیسامەددین عەلی (١٨٦٢-١٩٣٩ز): سۆفییەکی ناوداری کوردە، خەڵکی تەوێڵەیە، شاعیر لە چەند شوێنێکی تریش ناوی هێناوە و فرمێسکی بۆ ڕشتووە.

٢- کینایە: باسکردنی شتێك بە دەستەواژەیەکی ناڕاستەوخۆ، دوو نیازی.

٣- موعەمما: وشەیەك یان ڕستەیەك ماناکەی شاراوە بێت، مەتەڵ. واتە: با ئیتر لەگەڵ یەکدا ڕاستگۆ بین و بە ئاشکرا بدوێین و قسە لەیەك نەشارینەوە.

٤- وەلی: ڕێبەر، پێشەنگ: ئاماژەیە بۆ شێخ حیسامەددین، سوڵتانی وەلی و شاهی عەلی، هەر بۆ شێخ حیسامەددین دەگەڕێتەوە.

٥- وەلی عەلی: ئاماژەیە بۆ شێخ حیسامەددین کە ناوی ڕاستەقینەی (عەلی)یە.

٦- سەبت: سەلماندن، ڕابەر.

یـــــادی لـــــه دڵا قیبلــــەنومای گیـــانی زەووارە[1]
(نـــەوحی) نەفەســـت ڕاگـــرە بـــۆ یـــادی حـــەبیبت
چـــاتر لـــە بەهەشـــتێکە نـــە یـــاری لـــە کـــەنارە

١- زەوولر: ئەوەی کە زیارەتی ئارامگەی پیاوچاکان دەکات، زۆر دیدەنی کردن.

## شیوەن بۆ شێخ محەممەد عارف تاڵەبانی[1]

چییە ئەم ماتەمە کوردە دوو عەشرەت وا شڵەژاوە ؟
نەبیرەی تاڵەبانی و زەنگنە ئاغەی گشت خرۆشاوە
لە هەردە هەر پەلێ پۆلێ سوارە قوڕ بەسەر دەگرین
بۆ ئەو گەنجە بێ ڕەنجە لە ژینا گیانی لێژاوە
لە شێخی تاڵەبانیو زەنگنە و دێهاتی هەر دوو لا
سیا پۆشو لە شینایە هەموو فرمێسکی ڕێژاوە
بە ئاگری مردنی ئەو شێخ محەممەد عارفە گەنجە
جگە لەم عەشرەتانە باوکی خۆ جەرگی برژاوە
وەفادارو جەرگ قایم حەیامەندو[2] ڕەوشتی پاک
کە ئەم چوارە لە گەنجێکا مەگەر ئەو بێ کە ڕەژراوە
هیوا وایە کە داپۆشرێ بە چاکەی تاکە یەزدان
شەهیدی خوێنی دڵ بوو تا ژیانی ماوە قرچاوە

---

١- شێخ محەممەد عارف (١٩١٥-١٩٤٥ز) کوڕی شێخ عەبدوڵڵا کوڕی شێخ تاها کوڕی شێخ سەمەدی تاڵەبانییە لە ئاوایی (کانی قادر-شێخ سەعدوون) لە ناوچەی بنارگل دادەنیشت. ئامۆزای مامۆستا شێخ تەیب شێخ سەعدوون (١٩٢٧-١٩٩٥ز)ی شاعیرە کە دیوانە شیعرێکی دەستخەتی هەیە و تا هەنووکە لە چاپ نەدراوە. ئەمەش نموونەیەکە لە بەرهەمەکانی:

ملوێنێ شەمشەمەکوێرە بدۆشە تا چۆڕی لێ نەبڕێ
ئایا لەو باوەڕەی بتداتێ شیری یەک پیرە مەڕێ
سەد شمشێری داریین دروستکە دەمی وەکو ئەڵماس
هەرگیزلو هەرگیز بۆت نابڕێ تاقە سینگی سووچەڕێ
تاقە دەنکێ یاقووت بخەرە بازاڕی سەودا
زۆر بە نرختره سەراسەر گەر بفرۆشی بەردی خڕێ
سەد دنیای ڕەنگاوڕەنگ لە بەرکا مرۆڤی هیچو پووچ
قەت ناگا بەوەی کە لە بەرکا پیاوێ مەرد جلکە شڕێ

یان:

شووشەی دڵ کە شکا پارە ناکا پینەو پەڕۆ
ئەگەر مەردی سەرفیرازی دڵ بەجێ بێڵەو بڕۆ

ئەوەشمان لەیاد نەچێت شێخ تەیبی شاعیر و مەلا نەوحی ئاشنایەتیی و دۆستایەتییان لەگەڵ یەکدا هەبووە و یەکترشیان خۆش ویستووە. لە ساڵی (١٩٩٢ز) ئەو شیعرەی سەرەوەمان لە زاری خۆی وەرگرت.

٢- حەیامەند: مرۆڤی بە حەیاو بە شەرم، سەلار، بە ئەدەب.

وەرە (نـــەوحی) لـــە تـــاریخی وەفاتیـــشی کـــەمێ بـــدوێ
(بەشـــی غـــەم بـــێ)[1] بـــە مێـــژووی مـــەرگی کـــاتێ کـــە نێـــژراوە

## شیوەن بۆ مردنی شێخ حوسێن شێخ قادری کریچنە[2]

ســـاخوا ســـەبرێ بنێریـــت و بـــرینی خـــۆش بـــێ
یـــەعنی ڕەحمێکـــی بـــبێ جێگـــە نـــشینی خـــۆش بـــێ
بێـــشەی کریـــچنە شـــێری گەلێکـــە بێگومـــان
ئەوە پێویستە کە بە سەر تەخت نشینی خۆش بێ
نەتـــەوەی قـــوتبی زەمـــان عەبدولکـــەریمی[3] دووەم
لایقـــی مەســـنەدی ئـــەو زاتـــە نگـــینی خـــۆش بـــێ
(شـێخ محەممـەد)[4] کـە لـە زوهـدا[5] لـە قەناعـەت کۆکـە
ڕەبـبی ئـەو زاتـە شـەریفە بـە شـیرینی خـۆش بـێ
لـــە بـــەراتا بـــە کـــوڕو خـــزم و کەســـانی پـــاکی
هـەموو سـەر بـەرزو ڕەواو هـەموو ژیـنی خـۆش بـێ

---

١– بەشی غەم بێت: بە حیسابی ئەبجەد و بە ڕێنووسی کۆن (بشی غم بی) دەکاتە (١٣٦٤ك) بەرامبـەر بـە سالّی (١٩٤٥ز) کە ڕاڤەکەشـی بـەم جۆرەیـە: ب= ٢ + ش= ٣٠٠ + ی= ١٠ + غ= ١٠٠٠ + م= ٤٠ + ب= ٢ + ی= ١٠ کـە هـەمووی دەکاتـە (١٣٦٤ك). شاعیر لە کۆتایی شیعرەکەیدا ئەم تاکە خشتەی دەربارەی کۆچکردنی شێخ تاهـای باپیرەی شێخ محەممـەد عارف وتووە:

شـــێخ تاهـــای شـــێخ ســـەمەد کـــوا تالّـــەبانی دەشـــتنی؟
ســـالّی (بـــێ غـــەش) بووەتـــە تـــاریخی وەفـــاتو کوشـــتنی

سالّی بێغەش بە ڕێنووسـی کۆن بـە حیسابی ئەبجـەد بـەم جۆرە (بی غش) بنووسرێت دەکاتـە (١٣١٢ك) بەرامبـەر بـە (١٨٩٤ز)، واتە شێخ لەم ساڵەدا کۆچی دوایی کردووە. ژمارەکانیش بەم جۆرەیە: ب= ٢ + ی= ١٠ + غ= ١٠٠٠ + ش= ٣٠٠ کە هەمووی دەکاتە (١٣١٢ك).

٢– شێخ حوسێن (١٨٨٣–١٩٢٨ز): کوڕی شێخ قادری کریـچنەی تەپلـەڕەش کـوڕی شـێخ عەبدولکـەریمی کەسـنەزانییە. سۆفییەکی ناسراوی ڕۆژگاری خۆی بووە. لە تەکیەی کەسنەزانی لە ئاوایی کریچنە کە دەکەوێتە بناری شاخی سەرگرمەوە، سەر بە سەنگاوە بە خاك سپێردراوە.

٣– عەبدولکەریم: برای شێخ حوسێن و کوڕی شێخ عەبدولقادری تەپلەڕەشە، لە سالّی (١٩١٥ز) لـە دایك بـووە و لـە ڕۆژی (١٩٧٨/٢/٥ز) لە کەرکووك کۆچی دوایی کردووە و لە تەکیەی کەسنەزان لـە کریـچنە بـە خـاك سپێردراوە. جێگری شـێخ حوسێنی برای بووە. خاوەنی تەکیە و سەدان خەلیفەو دەروێش بووە. لـە پـاش خـۆی، شێخ محەممـەدی کـوڕی جێگـای گرتەوە و گەلێ دەروێشی لە ئێراق و ئێران و تورکیا و پاکستان و ئەفغانستان و میسر و سوودان و مەغریب و ئەردن و فەلەستین و لەندەن هەیە. ئێستا لە سلێمانی نیشتەجێیە، هەمیشە ڕانکوچۆغە دەپۆشێت، هەستی کوردایەتیشی هەیە.

٤– شێخ محەممەد (١٩٠١–١٩٨٤ز): کوڕی شێخ قادری کریچنەیە، واتە: برای شێخ حوسێنە.

٥– زوهد: دینداری، خواناسی، ئەوەی ئایین زۆر کاری تێکردووە.

## شیوەن بۆ شێخ محەممەدی شێخ عەبدولکەریم[١]

لــــە کــــوردا هەمیـــسان چ قەومایــــەوە
بـــە ئـــەم شــیوەنە دڵ ئەبوورایــــەوە
گڵێـــوڵی وەجـــاخی ســـەرۆک ئاینـــە
نـــەبیرەی حوســـەینی[٢] بـــوو کووژایـــەوە
لــە (قــادر کـــەرەم) شــێخ محەممــەد کــەوا
لـــە جـــاددەی تەریقـــەت ســـرەوتایەوە[٣]
شـــەریعەت عـــەزاخوان[٤]، تەریقـــەت ئــەڵێ
محەممـــەد لـــە ئێمـــە کـــە شـــارایەوە
بــە ئەبجــەد (خــوا رەحمــەتی حــەق)[٥] بــدا
بــە مێــژوو کــەوا کۆچــی پێـــچایەوە
سوپاســـی خـــوا جێنـــشینی هەیـــە
گــوڵی تــازە لـــەو باغـــە رازایـــەوە
موســـەمما[٦] بــرایم خــەلیلی[٧] وەتـــەن
لـــەبۆ نیـــشتیمان ژینـــە ئەژیایـــەوە

---

١- شێخ محەممەد (١٨٩١-١٩٥٤ز) کوڕی شێخ عەبدولکەریم، قادر کەرەمی کوڕی شێخ حوسێنی شەهید کوڕی شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجییە. وا دەگێڕنەوە کە پیاوێکی بە ئاین و لە خواترس و کوردپەروەر بووە، لە تەمەنی (٦٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە (قادر کەرەم) سپاردەی گڵ کراوە. لە ناو لاوێتیدا ئارەزووی لە ڕاو و تفەنگچێتی کردووە، لە کاتی ڕووداوەکانی بە ئارام بووە، لە حکوومەتی شێخ مەحموودی حەفیدا (سەرتیپ) بووە، لە پاشاندا ئاین کاری تێکردووە و بووەتە (سۆفی). لەو کەرامەتانەی کە نواندوویەتی یەکێکی ئەوە بووە لە (بانەبۆن) لە ناوچەی (قورەتوو)ی خانەقی چەند پۆلیس و بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوت و چەند کەسێکی ئینگلیز ئاگرێکیان بۆ کردووەتەوە و ئەویش چووەتە ناویەوە و بە ئەمری خوای مەزن هیچی لێ نەهاتووە.

٢- حوسەین: باپیرەی شێخ محەممەدە کە شاعیر بۆی دەلاوێنێتەوە.

٣- سرەوت: ئارام، سەقامگیر.

٤- عەزاخوان: پرسەنامە، واتە: بە بۆنەی کۆچککردنی شێخ محەممەدەوە شەریعەت پرسەنامەی بۆ تەریقەت ناردو سەرەخۆشی لێ دەکات.

٥- (خوا رەحمەتی حەق) بە ڕێنووسی کۆن (خوا رحمتی حق) بە حیسابی ئەبجەدی (خ= ٦٠٠ + و= ٦ + ا= ١ + ر= ٢٠٠ + ح= ٨ + م= ٤٠ + ت= ٤٠٠ + ی= ١٠ + ح= ٨ + ق= ١٠٠) کە هەمووی دەکاتە (١٣٧٣ک) بەرامبەر (١٩٥٤ز) کە ساڵی مردنی شێخی ناوبراوە.

٦- موسەمما: ناونراو، دیاریکراو.

٧- برایم خەلیل: ئاماژەیە بۆ شێخ ئیبراهیم (١٩٢٠-٢٤/١٠/٢٠٠٥ز): کوڕی شێخ محەممەد کوڕ شێخ عەبدولکەریم بەرزنجییە. لە پێشدا لە ئاوایی (قەڵای میکائیل) دانیشتووە و لە پاشاندا چووەتە (قادر کەرەم) و لەوێ بە ڕاسپاردەی شێخ عەبدولکەریمی باپیرەی لە تەکیەی شێخ حەسەن قەرەچێوار (١٨٤٧-١٩٠٦ز) نیشتەجێ بووە. لە هەشتاکانی سەدەی پێشوودا بە زۆر لە قادر کەرەم وەدەر نراوە و لە کەرکووک نیشتەجێ بووە. لە کەرکووک تەکیەیەکی بەناوی خۆیەوە دروست کردووە و خاوەنی سەدان خەلیفە و دەروێش بووە. مرۆڤێکی ڕۆشنبیر و ئەدەب دۆست بووە. نەتەوە و نیشتیمانەکەی خۆش ویستووە. ڕۆژی (٢٤/١٠/٢٠٠٥ز) کۆچی دوایی کردووە و لە (قادر کەرەم) سپاردەی خاک کراوە.

## شیوەن بۆ جەنابی شێخ عەبدولکەریم[1]

تەمی ماتەمێ تر نەڕەوایەوە
کە هەوری خەفەت هەم یەکی دایەوە
فەلەك گاڵ ئەدا غەم ببارێنێ هەم
لە ماوەی کەمیدا خولی دایەوە
لە ئاسمانی ڕێگەی تەریقەت کەوا
ستارەی بەیانی درەوشایەوە
سەری پۆلی دەروێشی ئایین پەرست
لە جاددەی ژیانا کە هۆیدایەوە
لە نوتفەی[2] حوسێنو بە وێنەی حەسەن[3]
کە عەبدولکەریم ژینی هەم دایەوە
سەرۆکێ موسەققەف سەریحو ئەدیب
ئەو بە ئیرشادی دەروێشو کورد مایەوە
پسا بەندی ئەندامی دەروێشان
بە جیداری[4] جادە سپێرایەوە
بە زانستی ئەبجەد لەبۆ پاشە ڕۆژ
لە یەزدانە (نەوحی) ئەپاڕایەوە
بە مێژوویی ساڵی وەفاتی ئەڵێ
(بە هەشتی خوای کۆچی)[5] گلدایەوە

---

١– شێخ عەبدولکەریم (١٨٧٩–١٩٥٤ز): کوڕی شێخ حوسێنی شەهید کوڕی شێخ عەبدولکەریمی بەرزنجییە. پیاوێکی سولرچاك، وریا، ئاینپەروەر، چاوتێر و بەغیرەت بووە. هەرگیز ناهەقی لە کەس قبووڵ نەکردووە. دەستی شیعرنووسینیشی هەبووە و نازناوی (خادیم)ی بۆ خۆی داناوە. لە بواری مەقامی کوردیدا شارەزاییەکی چاکی هەبووە و دەنگیشی خۆش بووە. لە تاقی لاوێتیدا، ئارەزووی لە ڕاوو شکار کردووە. لە ساڵی ١٩٥٤ز لە (قادر کەرەم) ئەمری خوای کردووە و هەر لەوێیش بە خاك سپێردراوە.

٢– نوتفە: نەوە.

٣– حەسەن: ئاماژەیە بۆ حەزرەتی حەسەن کوڕی ئیمامی عەلی (س.خ).

٤– جیدار: دیوار.

٥– بەهەشتی خوای کۆچی: بە ڕێنووسی کۆن (بهشتی خوای کوچی) بە حیسابی ئەبجەد دەکاتە (١٣٧٣ك) بەرامبەر ساڵی (١٩٥٤ز) کە ساڵی مردنەکەیەتی کە بەم جۆرەیە: ب= ٢ + هـ= ٥ + ش= ٣٠٠ + ت= ٤٠٠ + ی= ١٠ + خ= ٦٠٠ + و= ٦ + أ= ١ + ی= ١٠ + ك= ٢٠ + و= ٦ + ج= ٣ + ی= ١٠ کە هەر هەمووی دەکاتە (١٣٧٣ك).

## شیوەن بۆ عەلی ئاغای زەنگنە[1]

گـردەوە بـوونی عەشـایر بـۆ غەمـە، ئایـا چـییە؟
شین ئەکا کوردیّ لە هـەردە شـینەکەی، ئایا چییە؟
وا تـــەمی ماتـــەم لەســـەر کـــوردی زمانـــا هـــاتووە
هەوری چەرخی کەچ مەدارە[2] غـەم ئـەبارێنیّ، چییە؟
دەستەیەکی خـوێن بـە چـاوو کۆمـەڵێکی قـوڕ بەسـەر
پیادە خۆیدا بەر چەپۆك و سوارە گوڵبـانکی[3] چـییە؟
دەنگـی ڕۆ ڕۆ، ناڵـەیی دڵـسۆز، بـانگی عەشـرەتی
ئاسمـــانی گرتـــەوە ئـــەم کـــردەوە ئایـــا چـــییە؟
بـۆ عـەلی ئاغـای حەسـەن ئاغـا سـەرۆکی زەنگنەیـە
کـوردە وا مـاتو غەمینـە بـۆ ئـەوە هێـشتا چـییە؟
گیانی بۆ سەیری بەهەشت و ڕەحمەتی یەزدان ئەچیّ
تـا بـە ئەبجـەد تێگـەین ژیـنی عـەلی ئاغـا چـییە؟
با غەمیش[4] (نـەوحی) لـە مێـژووی مردنـی ئـەو دابـنیّ
بـۆ لەمـــەودوا بـیری هـۆزی بێتـــەوە ئایـــا چـــییە؟

---

١- عەلی ئاغا (١٨٩٠—١٩٣٤ز): کوڕی حەسەن ئاغای عەلی ئاغایە. یەکێك بووە لە سەرەك هۆزەکانی زەنگنـە. لـە ئـاوایی (دوانزە ئیمام) دادەنیشت و دۆست و یاوەری شێخ مەحموودی نەمر بووە.

٢- چەرخی کەچ مەدار: واتە ئەم ڕۆژگارە بە چەوتی دەخولێتەوە.

٣- گوڵبانگ: بە جوان بانگکردن.

٤- با غەمیش: بە ڕێنووسی کۆن (با غمیش) بـە حیـسابی ئەبجـەد: ب= ٢ + أ= ١ + غ= ١٠٠٠ + م= ٤٠ + ی= ١٠ + ش= ٣٠٠ کە هەر هەمووی دەکاتە (١٣٥٣ك) بەرامبەر بە ساڵی (١٩٣٤ز) کە ساڵی مردنی عەلی ئاغایە.

## ژیانی خۆی ئەویٚ ئەوەی

ژیانی خۆی ئەویٚ ئەوەی کە دەربەس ئەتۆ نییە
لەبۆ نەیار خەزوورەیە کەوا بێ هیچی تۆ نییە
کە ئەو لە هۆزی تۆ نییە سەرۆکی تامی چی ئەدا؟
لە پلە کەوتە سەر ئیتر هیوای بە ژینی تۆ نییە
کەسیٚ کە تێبگا بە گا بکێڵیٚ سەر پەڵە بە جووت
لە کاتی جۆ درەو هیوای بە تۆو و وەردی کەی نییە
بە ڕەنجبەرێکی دۆسیەتی دووگاوەسن[١] بکاتەوە
هیوایە یەك بە سیٚ بڕیٚ بەڵام لە تۆوی تۆ نییە
ئەمەش بە بیرو تێگەیین بە بیری تیرو تانە نین
لە بێشە شێر کە دەرکەویٚ بە بێشەی ئەتۆ نییە
هەتا بەکەی جلی کەری نەیار کە ڕاست ئەکەیتەوە
بە دەم قیاسی فەسڵەوە نەتیجەکەی بە تۆ نییە
لە (نەوحی) تۆ بپرسە بۆ بە ئێشی دڵ ئەیڵێتەوە
لە خەو شەبەق کە داپەڕی بە نیوەڕۆ خەوی نییە

١– دووگاوەسن: دووگاسن، زەوییەك کە دووجار کێڵدرابێت.

## خەسوو و خەزوورە

خەسوو و خەزوورە بۆ زاوای ئەوێ
بەشکو لە باخەڵ کچەکەی خەوێ
خەسوو تاکێکە، خەزوورە جووتە
بووک دوعا ئەکا بابانی شەوێ
بووکی ڕازاوە مەڵبەندمانە
سەد ملوێن ئەژی تاکە یەک شەوێ
دای بە شیربایی بە ناحەزی کورد
مارەیان بڕی چۆن پەکی کەوێ
کچی بێچارە بێ دەستەڵاتە
بە بابی ئەڵێ هەی کۆست کەوێ
بمدە بە یارێ یاوەری کوردە
مەمدە بە یارو بابانم شەوێ
من کوردم ئەویش لە کورد بێزارە
حاشای لێ ئەکەم من ئەوم ناوێ
شەرتە ئەو ڕۆژە باوەخوونم کەن
ناڕۆمەوە لای تەڵاقم ئەوێ
بمدە بە یەکێ سووتاوی من بێ
لە عەرشی عەشقم تەنیا سەرکەوێ
ئەو خۆی و هۆزی خوێن مژی ئێمەن
پێویستی نەبێ توخنی ناکەوێ
قازی هاوارم هێنایە لای تۆ
ملوێنێک زێڕم هەیە بتەوێ
بەو شەرت دابڕی بەینی منو ئەو
من لە تۆم ئەوێ تەڵاقی کەوێ
زاوای بێگانە هەر دۆستی گانە
کوردی خۆییە سەربەخۆی دەوێ
قازی شاهید بە باوکم وەکیل بێ
بمدا بە شوانێ کە کوردی ئەوێ

مەفرۆشـــە مەڵبەنــد شـــیربایی مـــەخۆ
هـــەر کەســـێ ئـــەیکا بـــەر لەعنـــەت کـــەوێ
کـــچ بـــە نـــاڕازی بـــە زۆری پـــارە
تاکـــە جـــووت نـــابێ گێـــرە ئەشـــەوێ
(نـــــەوحی) هـــــۆنراوەت منالآنەیـــــە
کـــاتی ســـەرنجە خـــۆ بـــیری ئـــەوێ

## هەجووی داروودەستەی

## رژێمی پاشایەتی

ئـــــەی کۆمـــــەڵی کوردینـــــــە وا
لەگــــــەڵ عـــــەرەب بووینـــــە بـــــرا
جەمهووریــــــــــە بپـــــــــارێزن
لـــــە تـــــاریکی وەکـــــو چـــــرا
کـــوا خێڵـــی هاشـــم یـــەك ســـەری؟
ناوونیـــــــــشانی هـــــــــەڵوەرا؟
کـــوا (نـــوری) پاشـــای بێـــوەژن؟
چـــۆنت کـــە دیو چـــی لێکـــرا؟
بـــۆ تێگـــەین عـــەرزت ئەکـــەم
بیگـــرە لـــە گـــوێ وەك دووبـــرا
دوو دڵ مەبـــە بـــۆ پێـــشەوە
ئـــالآی سەربەســـتی هـــەڵکرا
گـــــــرنگترین ئـــــــارەزوو
ئاشـــتی لـــە نێـــو دۆســـتو بـــرا
موکافەحـــــەی کۆنـــــە پەرســـــت
بـــە دەم بـــە دەســـت چـــۆن بـــۆتکرا
خزمـــــە وە یـــــا بێگانەیـــــە
کـــــوردم نـــــەبێ زوو دەرکـــــرا
پـــێ داگـــرەو راســـتی بڵـــێ
چـــواردەی تـــەمووزە وەك چـــرا
تـــاریکی زوڵـــمو جـــەوری وا
روون کـــــردەوەو رێ دەرکـــــرا
مەلـــەکی چەرچـــی[1] تێپـــەڕی
(وەســـی)[2] راوچـــی ســـەربڕا

---

١– چەرچی: دێوەرە، فرۆشیاری گەڕیدە.

٢– وەسی: ناوی عەبدولئیللایە و کوڕی عەلی کوڕی حوسێنە. لە ساڵی (١٩١٣ز) لەدایك بووە. خاڵۆی مەلیك فەیسەڵی دووەمە و لەبەر ئەوەی مەلیك منداڵ بووە، ئەم کاروباری دەوڵەتی بە ڕێوە بردووە. ساڵی (١٩٥٨ز) کوژراوە.

(نوری) بە ڕوو لەی زۆڵییە
وای لێکرا، وای لێکرا
چواردەی تەمووزی شادییە
وا جەژنی ئازادی کرا
ساڵی هەزارو نۆسەدو
پەنجاو هەشتە ئەی برا[١]

١- واتە: ئەم شیعرە لە ساڵی (١٩٥٨)دا وتراوە.

## نەوحی هەجووی نوری سەعید دەکات

ئەو پیرە مێردەی لە ئاین بێزار
نوری سەعیدە سەگی ئیستیعمار
چل و دوو ساڵە سەگی ڕاویە
دۆستی جولەکەو کلکی ئیستیعمار
مەسەلیٚ کوردەو وتەی خۆمانە
سەگی هار تەمەن بە چل ئەکا کار
ئەمڕۆ کە چواردەی میوە گەنانە
چللەی تەواو بوو وەکو سەگی هار
دوژمنی دینو نیشتیمانی بوو
بۆ کوردو عەرەب هەم نەبوو بەیار
چاو تورکانیٚ بیٚ ئەمری نەکرد
نەك لێی بڕەنجیٚ ئینگلیزی غەدار
تەمەن لە هەشتا بووە پیرەژن[1]
بە کراسی شینو عابای سیاکار
لە پاشا کۆمەڵ غەزەبیان لێگرت
خۆی و هاوڕێی و دۆستی بەیەکجار
عەبدولئیلاهی[2] لەگەڵ خوارزاکەی
کتکەنەوتینەو[3] سەباحی[4] سەگسار
کوژران هەڵدڕان پەتپەتی کران
بە کوێری چاوی هەموو ئیستیعمار
پەتی پەیمانی[5] بەغدایان بڕی

---

١- نوری سەعید بە بەرگی ژنانە و عەباوە ویستی خۆی لە دەست شۆڕشگێران ڕزگار بکات و هەڵبێت، بەڵام هەوڵەکەی بێکەڵك بوو.

٢- عەبدولئیلا (وەصی): کوڕی عەلی کوڕی حوسێنە، خاڵۆی مەلیك فەیسەڵی دووەمە. لەبەر ئەوەی مەلیك منداڵ بوو، ئەم کاروباری دەوڵەتی بەڕێوە دەبرد و سەرپەرشتی مەلیکی دەکرد. لە پاش شۆڕشی (١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ن) لەگەڵ بنەماڵەی مەلیکدا کوژرا.

٣- کتکەنەوتینە: کلکەنەوتینە، نازناوەگێڕ، ئاماژە بۆ نوری سەعیدە.

٤- سەباح: کوڕی نوری سەعیدە، ئەفسەری فڕۆکەوانی بووە، ئەمیش ڕۆژی (١٩٥٨/٧/١٤ن)دا گیرلو کوژراوە.

٥- پەیمانی بەغدا: هاوپەیمانی بەغدا لە ساڵی (١٩٥٤ن)دا لە نێوانی ئێراق و ئێران و تورکیا بەسترا، هاوپەیمانییەکی ئیستیعماری بوو، لەپاش شۆڕشی (١٤ی گەلاوێژی ١٩٥٨ن)دا هەڵوەشایەوە.

عەنقەرەو ئێران مایەوە بێ کار
دالاسو[1] ئیدن[2] لەگەڵ بنگۆریۆن[3]
وەك گۆڵدمایر[4] هەموو شەرمەزار
بەلام لەناو خۆو گەلی پاسەبان
بێ مووچەو بەرات بۆیان بوونەیار
ئەمانەش ئەگەر نەمێنن هەموو
گەلیەتیەکەمان ئەبێتە گوڵزار
حوسەی عەبدوڵلاش[5] پرسەی داناوە
بۆ گیانی پیسی هۆزەکەی مردار
عەبدولکەریمی قاسم با خۆش بێ
بژی ئازادی بمرێ ئیستیعمار
لە ماتی کۆمار هەر کەسێ وا بێ
ئەبێ وای لێ بێ بە چارو ناچار
نۆسەدو پەنجاو هەشتی مێژووە
چواردەی تەمووزە جەژنی یادگار
نیشتیمان لە دەس وەتەن فرۆشان
وەرگیرایەوە کرا بە کۆمار
عێراق بریتییە لە کوردو عەرەب
لەمە بەولاوە قەت نابێ بەیار
دایکی وەتەنمان دوو کوڕی هەیە
عەرەب و کوردی بە هێزو دەمار
بەم دەساوێژە هەموو دڵخۆشین
هەموو وەك (نەوحی) بووینە فیداکار

---

١– دالاس: لە پەنجاکانی سەدەی پێشودا، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بووە.

٢– ئیدن (ئنتۆی ئیدن): وەزیری دەرەوەی بریتانیای ئەو ڕۆژگارە بووە.

٣– بنگوریون: سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل بووە.

٤– گۆلدمایر: سەرەك وەزیرانی ئیسرائیل بووە.

٥– حوسەی عەبدوڵلا: مەلیك حوسێن کوڕی عەبدوڵلایە، شای ئەردەن، کاتێ بنەماڵەی مەلیك فەیسەڵ لە(١٩٥٨/٧/٤)ن کوژران، ئەم پرسەی بۆیان گرتەوە؟ چونکە ئامۆزایان بوو.

## له هەجووی سنه شێخ ڕەزام

لـــه هـــەجووی ســـنه شـــێخ ڕەزام گـــەر بکـــەم
فەقـــەت کـــوردن ئـــەوە ئـــەوەش تـــەرك ئەکـــەم
کەســـیێ گـــەر چـــووبێتە ســـنە دەفعەیـــەکی
ئەگـــەر غەوســـی بەغدایـــە تـــەرکی ئەکـــەم
لیـــوای ســـنە حـــوکمێ تەشـــکیل بکـــا
بـــە قـــاتیو[1] بـــە تـــاعوون خـــەرابی ئەکـــەم
(موکریـــانو بانـــەو ســـەقز) عەشـــرەتن
هـــەموو مـــەنگوور و مـــامش[2] فـــەرز ئەکـــەم
مەگـــەر (نـــەوحی) تـــەرحی ئەساســـی بـــبێ
یـــەکا یـــەك ئەمانـــە لـــەوان دەربکـــەم

---

١- قاتی: نەبوونی، دەس نەکەوتنی بژێو.

٢- مەنگوڕ و مامش (مامەش): دوو هۆزی کورد لە ناوچەی پشدەر و موکریاندا نیشتەجێن.

## نەوحی هەجووی نوشتەنووسەکان دەکات

بڕێ لە مەلای تێنەگەیوەکان
گەلێ شێخانی پێنەگەیوەکان
لە لایان وایە نوشتە بەکار دێ
بۆ سیلو دیقو[1] هەموو دەردەکان
نەخوازەڵلا ئەو، سۆفیو دەروێشە
کە هیممەتی شێخ حازرە لایان
ئەڵێن بە قوربان حەزرەتی شێخ بم
لە کەرکووکەوە چوو بۆ هەمەدان
بەڵام حەزرەتی شێخیش لە ماڵا
ئاگاهی نییە لە منداڵەکان

---

١- دیق: دەردەباریکە، وەرەم، خەم و پەژارە.

## نەوحی ئامۆژگاری منداڵانی کورد دەکات

من لەگەڵ تۆمە منداڵی کوردان
ئەی نەونەمامی نێو باغی ژیان
لەناو خوێندنا خۆت بچورستێنە [١]
لە پێگەیینا مافت بستێنە
ئەوەی پیر بووە لە دەست دەرچووە
هیوا بۆ ئەوە وا پێگەییوە
ئەی برای منداڵ من لەگەڵ تۆمە
نەخوێندەواران وا لە ژێر گۆمە
ژیانو ئاین، کۆمەڵایەتی
پێکەوە بەستی شارو دێهاتی
بیهێنە سەرا، ئەوەی نەزانە
بە چاکەو بیرو وتەی پیاوانە
چونکە خوێندەوار وتەی ڕەوایە
جوانی بەهۆشە نەك بە کەوایە
ئەوەڵ بۆ بابو داكو دراوسێ
دووهەم بۆ ئەوەی کە تۆ ناناسێ
چاکەو پیاوەتی تۆ پێی بنوێنە
ژاری دوو دڵی تۆ پێی بتوێنە
میللەت پەروەر بەو هەژار پەروەر بە
هەر کەسێ وابێ بڵێ سەروەر بە
ئەدرەسو نووسین بە ڕاوێژو بیر
پاڵەوانێکی خاوەن ڕمو شیر
دوژمن لە خوێندن هەموو سڵ ئەکا
نا خوێندوو سپڵی [٢] لەسەر دڵ ئەکا
نوکتەی شیرینو وتەی بە بایی [٣]

---

١– خۆت بچورستێنە: خۆت ماندوو کە، خۆت قاڵ کە.

٢– سپڵ: پارچە گۆشتێکی ڕەشە لە هەناودا. واتە: نەخوێندەوار بە کارامە بیر ناکاتەوە، بەڵام خوێندەوار بە هزر و هۆش و زانیین بیر لە هەموو شتێك دەکاتەوە. شاعیر بەتەوسەوە بۆ نەخوێندەوار بە کاری هێناوە.

٣– وتەی بە بایی: وتەی بە نرخ.

فێربەو فێر بکە بۆ کوردی دوایی
تیپێ مندالّی، تر بە جێماوە
بە تەمای تۆیە چیت بۆ داناوە
دەساوێژی باش هێزی هەموانە
بۆ خۆتو هەموو نەوەی کوردانە

## من کچی کوردم[1]

من کچی کوردم دڵسۆزم ناوە
لە تێنەگەیوان سەرم سڕ ماوە
من ئەڵێم کوردم، کوڕ ئەڵێ کورد نیم
بۆ هەڵە بووە لەم بەندو باوە؟
ڕێوی لە کونا هەڵگەڕێتەوە
سەگ ڕاوی ئەکاو ئەیخاتە داوە
دۆم بە مشتەوە[2] بەرابەر دوژمن
ئەڵێ من کوردم وا ڕاوەستاوە
تۆ بە قەڵەمو سەقافەتەوە
بۆ کۆڵت داوەو خۆت لاداوە؟
بە نانە سکی پاسی غەیر ئەکەی!
هێشتاکە ئەڵێی من شەرمم ماوە
ئەو برتە[3] کوردە وا کوردی ناوە
ئەڵێی سپێیە لە بەرگی داوە
بەرگی بە ئالۆش[4] کە ئەیتەکێنی
سپێی نامێنێ وا تێوەشاوە
ئینجا ڕوو ڕەشی بۆ ئەو کەسەیە
کوردەو لە کوردی ڕوو کا بەو لاوە

---

١- شاعیر ئەم شیعرەی بەناوی (دڵسۆز)ی کچیەوە نووسیوە.
٢- مشتە: ئامرازی چەرم کوتانی دۆم و پینەچی.
٣- برتە: بڕە، دەستە، گروپ.
٤- ئالۆش: خارشت و خورووی لەش.

(١)

سەیری باغی قازی بۆ ناکەی گوڵێ فەتوا ئەدا؟
سەر چڵی داری بە یاری بۆ نەیار ئیمزا ئەدا
ڕووی لە ئێمە دڵ لە ئەولا کۆمەڵانێ قاو ئەدا
سائیلی مەزهەب خەتایە چوارو پێنج فەتوا ئەدا

(٢)

چاوی مەستی تۆ نەبێ کێ جەردەیی ئیمان ئەکا؟
چەتری زوڵفت وا بەسەر گۆناتەوە سەیران ئەکا
داغی خاڵی لێوی تۆیە وا دڵم بریان ئەکا
جار بە جارێ چاو هەڵێنم بۆی بە کوڵ گریان ئەکا

(٣)

مێژووی هەر دەوڵەتێ بخوێنەوە باسمان ئەکا
ئافەرین بۆ بیری تیژو کردەوە ناسمان ئەکا
ئێمە خۆ خۆرین کە بۆیە ئەو بە نەسناسمان ئەکا
بەسیە هەستە ڕاپەڕە، وا ڕادیۆ کاسمان ئەکا

(٤)

چاوی کاڵی بۆ ئیشارەت دەرفەتێ پەیدا ئەکا
خۆ فرۆشە بۆ نیشانەی خۆیەتی پەیدا ئەکا
سرکە کاتێ وەرگەڕا خۆ حورمەتێ پەیدا ئەکا
مەرجەکەی دۆڕاند لەلا خۆ حورمەتێ پەیدا ئەکا

(٥)

پیشەو مەکری ئەتۆیە ڕۆژیشەو شەو دەرئەکا!
گوایێ ڕۆژی ڕووتە خاڵت وا لە پێچە دەرئەکا
ئەو بە فێڵو سەد نەزاکەت شێر لە بێشە دەرئەکا
قوڕ بەسەر کوردێ نەزانی هەردەکەی ڕێ دەر ئەکا

(٦)

چاوی بیمارت عەزیزم شایەتە جووتێ برۆت
هەر ئیشاراتی لە بۆ من شەو شیفایە بیدرۆ
لەنجەکەت فەسڵی قەریبو غەمزەیە موختەسسە بەخۆت
کوا وجوودی بوو لە غەیری تۆ بە لەنجە بێ برۆ

(٧)

چاو نەبێ دڵ بۆ خەیاڵی یار ئەگەر، هاوار ئەکا
دڵ پەسەندی گەر نەکا چاو کەی بەدوویا ڕا ئەکا
خوێن لەسەرچاوەی دەڕوونا دەشتی دڵ پاراو ئەکا
هەم خەتای چاوە عەزیزم چاوی نەرمی ڕاو ئەکا

(٨)

وێنەکەی (نەوحی) لە دیوانا بە خزمەت تۆ ئەگا
چونکە دڵسۆزە بە ئێوە خۆییەو خزمەت ئەکا
هەر وتارێ، گەوهەرێ، هۆنراوەیەکی سەد مەبەس
تێبگەی ئینجا ئەزانی تێگەیی‌و خزمەت ئەکا

(٩)

دەنگوڕەنگی دووری بۆ هێنای بە هێزی کارەبا
وا جیهازی گەرمی هێنا ساردیت بۆ لادەبا
هەرچی گۆبەندە لە ژێر خاکا کەوا هێنایە دەر
ڕەنجی سەد ساڵەی ژیانی تۆ بە ملقێ کۆی دەبا

(١٠)

ڕێڕەوی مەڵبەندی ئێمە تازە قیرتاوی کرا
ڕەوڕەوەی ڕۆژی وچانی بۆ قوتابی دانرا
وا گڵۆپی بیرو زانستی لە کوردا هەڵکرا
خۆزگە بەو کاتە نە یاری ئێمە وا لێی دەرکرا

(١١)

ڕووتە ڕێبینی گەلی کوردە وەکو قیبلە نووما
ئایەتی خاڵی سەری گۆناتە حوکمی کارەبا
ڕائەکێشێ کوردەواری دێتە مەیدانی وەفا
دوور بڕۆ وەک تێلی ڕادیۆ واتەمان بۆ یەک دەبا

(١٢)

تەمەن لە بیستا گەیاندم بە شەست[١]
لە خۆڵی بەرپێت دوو دیدەم پێ ڕەشت
ئێستا بینایم خەریکە کز بێ
بە هیوا گەییم بە پلەی سروشت

(١٣)

ئەو کەوا جەلسەی[٢] کراسی میبرەدەی[٣] کە دەسهاڕ[٤] ئەکا
تیلی چاوی وەرگەڕێنێ کۆمەڵێ بەس هار ئەکا
چی لە دەس دێ کوردی ئێمە زاریو هاوار ئەکا؟
شێخی بەرماڵ سەیریکا ئیمان لە دڵیا بار ئەکا

(١٤)

هەر نەزانین بوو لە مێژێ وا بڵاوەی کردە کورد
پیشەیێ وا فێر نەبوون پێی سەرکەون بۆ گردی[٥] کورد
نازی بێگانە ئەکێشن بۆ کوتاڵو شەکری ورد
پێنەگەی! وا پێنەگەیوی هەڵپەیەکە دەستو برد

---

١- شاعیر ئەم چوارینەیەی لە تەمەنی شەست ساڵیدا وتووە، واتە لە ساڵی (١٩٦٠ن)، هەر لەو ساڵەدا تانە کەوتووەتە سەرچاوی.

٢- جەلسە: جەرسە، جۆرە قوماشێکی جوان و دلگیری ژنانە.

٣- میبرەد: مەبرەد، ناوی چەشنە کوتاڵێکی جوانی ئافرەتانە.

٤- دەسهاڕ: دەستاڕ.

٥- بۆ گردی کورد: بۆ کۆمەڵی کورد، بۆ کۆکردنەوەی کورد.

(١٥)

مـن لـه واتـه زيـاتر چـيم لـه دەس نايـێ ئـيتر
سـەيری ژوڕوو خـواری خۆتکـه تازەيـه بـاوێ ئـيتر
ڕۆژی عـيلمو تێگەيينـه کاکـه پێـی نـاوێ ئـيتر
تـۆ بـه چـەپ کەمکـه تەماشـا ڕاسـتيکه چـاوێ ئـيتر

(١٦)

ئـەی خـوا خێـوی هـەمووماں تـۆی پزيـشکی دەردەدار
کـوردە بيمـاری هـەزارەو خانـه ويرانـەو هـەژار
تـۆ بـه ئـاوو خـاکی خـۆ دەرمـانی دەردێکـەو تيمـار
تـالۆزارە ئـەم ژيانـه بـۆ کەسـێکی زانيـار

(١٧)

نـووکی برژانگـت وەکـو خەنجـەری پـۆلای سـەوزەوار
ريـز ئەبەسـتێ بـۆ جـەرگ کـونکردنی دەسـتەی زەوار
سەرچـەمی وەسـڵت کـه لافـاو ڕێـژە بـەمن نـادا بـوار
چـونکه کـوردم بـێ ديـارو بـێ بـەهارو بـێ هـەوار

(١٨)

ئێمـه ژيـنو بيرمـان هاوێـشته زولـفو خـاڵی يـار
پيـشەيه بـۆ پاشـەڕۆژ فێـر نـەبووين بيکەينـه کـار
سـەيری بێگانـه لـه عاسمـان تەقڵـەبازە بـۆ خـوار
تـازە پێـی ناگـاتو بمـرێ چـاترە کـوردی هـەژار

(١٩)

مـن غـەريبو دەربـەدەر تـۆ گـوڵ بـه دەسـتو گـوڵ بەسـەر
تـۆ لـه شـاری کـەيفو خۆشـی مـن بـەدەر خـاکم بەسـەر
مـن لـه پـۆلی عاشـقان بـۆ نـاژمێری مـوو کەمـەر؟[١]
چۆن سـەرۆکی وا ئـەبێ ئـەی پـڕ جـەفا، ئـەی پـڕ هونـەر؟

١– مووکەمەر: موو: تاڵەموو. کەمەر: ناوقەد، واتە: ناوقەدی ئەو ئازیزە زۆر باریکە هەر وەك موو.

(٢٠)

یاری وێرانە هەوارو دۆستەکەی هۆزی نەیار
شەرتە دەستم پێی گەیی لەو ژوورە بیهێنم بە خوار
سەرکەوێ بۆ تەختی نەردی حوکمی یارانە بکا
چونکە سەرداری هەوارەو خێڵی ڕەشماڵ و دەوار

(٢١)

گردەواری[1]، کوردەواری بێتە پێوانەی مەبەس
پارچەیەکە سەربەخۆ پێویستی خۆ نابێ بە کەس
پان و پۆڕی خوارو و ژووری ڕاستو چەپ یەك بێ کە بەس
پشتیوانی پێ ئەوێ پێویستە بۆ یەك دادبڕەس[2]

(٢٢)

من لە خەستەخانەدا وا چاوەڕێی تۆزێ شیفام
تۆ پزیشکی سیحەتی دەردی منی پێ هەڵکفام[3]
مەرهەم و ژارت وەکو یەك گەر نەزانم بێوەفام
چی دەبێ وەك یەك تەماشای پۆلی خەستەکەی بەفام

(٢٣)

سەیری باغی یار ئەکەم تووشی نە یاری تۆش ئەبم
ڕەنجەڕۆم کوردم کە تازە بۆ نە یار تێکۆش ئەبم
گەر لەبەر پەنجەرە جارێ دەرکەوێ سەرخۆش ئەبم
پێی ئەڵێم چونکە نەزانم ساتێ هاو ئاغۆش[4] ئەبم

---

١– گردەواری: گردە: کۆ، کۆیە. وار: خاك، زەوی، واتە خاکی کوردەواری کۆیە، پان و پۆڕە و پێکیشەوە لکاوە، ئەمە ئاماژەیە بۆ کوردستانی گەورە.

٢– دادبڕەس: فریادەس، بە فریا گەیشتوو، واتە: سەرکردەیەکی ئەوێ هەر چوار پارچەی کوردستان ڕزگار بکات و بیکات بە کوردستانی گەورە.

٣– هەڵکفام: بۆم ڕەخسا، بۆم هەڵکەوت.

٤– ئاغۆش: باوەش، کۆش.

(٢٤)

چـاوەکەم بـۆ تێگـەیین تـۆ دەعـوەتی دیـوان ئەکـەم
بـیری ڕەزمو بـەزمی کـوردی حـازری نـاو خـوان ئەکـەم
بـیری کـوردی ژێـرە سەرچـاوەی وەکـو سـیروان ئەکـەم
مایـەی بـێ یاوەریمـە مـن نـەیار میـوان ئەکـەم

(٢٥)

لـەم نەخۆشـخانە وڕینـەی سـیحەتی خـۆم گـەر بکـەم
بـێ وجـوودی چـاوی چـاوان بـۆ سـەرۆکی گـەر بکـەم
خزمـە مـن لـەم دەردە تـازە بێتـو گـەر سـەر دەربکـەم
سـەر فیـدای یـاری بـە گـەل یـارو بـە دڵ یـاوەر بکـەم

(٢٦)

ئـاخۆ کـەی بێـتو شـیفایێ بـۆ بـرینی جەسـتەکەم
یـاخۆ جـاریێ پرسـێ چـۆنە حـاڵیو ویڵـو خەسـتەکەم
سـەر بـەخۆی خـۆ بـژێوی یـارو لەنگـەر بەسـتەکەم
بـێ بـە هـاواری هـەژاری کـوردی مارانگەسـتەکەم

(٢٧)

داغـی خـاڵی لێـوی تۆیـە جـەرگی وا سـووتاندووم
مەرکـەزی حەڵقـەی دوو زوڵفـت خـۆ دڵـی برژانـدووم
وەك بەکـەڵۆری لـە دووری خـۆ هەڵیقرچـاندووم
مـن لـە خـۆ ناگـەم کـە ئـەو یـارە بەچـی فەوتانـدووم

(٢٨)

ئـارەقی گوڵبـاخی گۆناتـە کـە مەسـتی کـردووم
خـاڵی لێـوت مـەززەدارەو دڵ بـە دەسـتی کـردووم
کـوردە بـازاڕە لـە کفـری زوڵفـی پەسـتی کـردووم
تیـشکی پرشـەی ڕۆژی ڕووتـە خـوا پەرسـتی کـردووم

(٢٩)

مەن غەریبی ڕووتو قووتم ژاری مارە نیوەڕۆم
ڕەوڕەوەم بێ سێبەرە چونکە خەیاڵە پێی ئەڕۆم
تاوێ لەرزو ساتێ تاوی تیشکی ڕووتە بۆی ئەڕۆم
نایگەمێ کوردینە نازانم بە دوویا سێبەڕۆم

(٣٠)

دەردم زۆر گرتووە بەڵام ئەمجارە زەحمەت هەڵبسم
جۆگەیە خوێنی جگەر فرمێسکی چاوم هەڵبەسم
خۆ لە سەد لاوە هیوام بڕا بە کوردی بێکەسم
مەر خوای کوردو هەموو عالەم بکا فەریارەسم

(٣١)

لە هەر چوار لاوە بێ لانەن، هەموو سەرکز لەبەرتانەن
چەپۆکی باوەژن خۆرن هەموو ژێر دەستی بێگانەن
هەموو ئاواتەخوازی، سەرۆکێ پاکی کوردانەن
هەوێنی یەکیەتیو زانستە تیماری، بیزانن

(٣٢)

دڵ لە غەم پڕ بوو ڕژا سەرچاوەی چاو بوو بە خوێن
من لە غوربەت ماتو بێکەس خزمینە ئێوە لە کوێن؟
ڕوونی دوا تاریکەسانی کوردی کاتێ دەرکەوێ
هەڵقوڵێ کانی ژیانو سەربەخۆ خۆی بێتە شوێن

(٣٣)

کانی زەڕنیقو کولوریات[1] بوو کە هێزیدا بەوان
هێنو گۆگردە نەبیرەیدا بەڵام هەر بۆ ئەوان
ئێمە نەك تەنیا هەموو لا گەردنی بۆ دانەوان
عالەمی پڕ هێزو قورسە، کوردە سووکو ناتەوان

---

١- کانی زەرنیق و کولوریات: ناوی دوو کانزان لە کوردستانی خۆرهەڵاتدا.

(٣٤)

ناوچە بڕژاوە لەبەر تیلی دوو چاوی بێگومەان
سێهەمی دووەم ئەخوێنێ دەست ئەدا تیروکەوان
سەردەقی کاری وەهایە کورد ئەخاتە پەرێشان
تەشوێ کلکی خۆی چلۆن ئەبڕێتەوە[1] ئەی کاکە گیان

(٣٥)

ئێمە بێ پیشەین بە ساقۆ[2] کۆنە کارسازی ئەکەین
هەر کەسێکی بێ خەبەر بێ ئەو بەسەر قازی ئەکەین
مەبرەدو جەلسەو گەبەردین[3] بۆ کچە سازی ئەکەین
شاڵو چۆغەی کورکی کوردە بەرگی سەربازی ئەکەین

(٣٦)

لە لێوی گۆمی ورمێوە هەتاکو وان هەموو کوردن
لەسەر چاوەی دیالەو دیژلەو[4] دیسان هەموو کوردن
لە ڕۆژئاوای ژوڕووشدا ڕەشاو چۆمی[5] قەرەسوو هەم
لە شیمالا هەتا ئاراس بەیەك پاتی[6] هەموو کوردن

(٣٧)

کەی ئەبێ ئاوا بکرێ خەستەخانەی کوردەکان
سەر پزیشکێ بێ بپرسێ بۆ برینو دەردەکان
کاتی دەرمان بێ بەزەیی بێ بە جەرگی کوردەکان
ئەو حەلە[7] ئۆخەی ئەکا دڵخۆش نەخۆشی کوردەکان

---

١- ئەم نیو باڵە لەو پەندەوە وەرگیراوە کە دەڵێت (تەور کلکی خۆی نابڕێتەوە).
٢- ساقۆ: پاڵتۆ.
٣- مەبرەد و جەلسە و گەبەردین: چەند جۆرە قوماشێکی ڕەنگامەی ئافرەتانن.
٤- دیژلە: ڕووباری دیجلە.
٥- ڕەشاوچۆم (قەرەسوو): ناوی چەمێکە لە کوردستانی باکوور.
٦- پاتی: پارچە، یەك پاتی: یەك پارچە.
٧- ئەو حەلە: ئەو کاتە.

(٣٨)

ئـــەو ولآتانـــەی کـــەوا یـــەك گرتـــوون ســـەر کـــەوتوون
وا لـــە پـــارێزی ئەتۆشـــن ســـەرکەون پـــەڕ کـــەوتوون
ئـــەو بـــە هێـــزی خوێنـــدن‌و پیـــشەو فرۆکـــەو کارەبـــا
ئێـــوە دازایـــین بـــەبێ پێـــزی نـــەزانین کـــەوتوون؟

(٣٩)

خـــەتو خـــاڵی ڕووتـــە سەرمەشـــقە لـــە بـــۆ کرمانجیـــان
کـــوردەواری وا بـــە قـــڕدا چـــوو بـــە تـــاڵان ڕەنجیـــان
هـــەر وتـــاری ئێمەیـــە خـــۆ وا لـــە باخـــەڵ گـــەنجیان
ســـەیری پیـــت‌و بـــەرگی کـــوردی چـــۆنە گەوهـــەر ســـەنجیان

(٤٠)

تـــەنگی ئـــەرزو ئاسمـــان کێـــشرا بـــە زانـــستی فـــڕین
وا فرۆکـــەی ســـاروخە بـــۆ مـــانگ ئەچـــێ ئـــەی ئافـــەرین
کـــوردە تـــۆ چـــۆن تـــێ ئەگـــەی دێـــوێ دەســـێکی لێوەشـــان
دەك تـــەریق بـــی بـــۆ کتـــێبی پـــیرەژن گێـــو ڕاپـــەڕین

(٤١)

تـــورك‌و ئێمـــە بـــێ هەوێنـــە تـــا بـــە دنیـــا[1] نامـــەیین
ســـەت سیاســـەتکاتو جـــادوو، ئێمـــە لـــەو تێناگـــەین
ئـــەو لـــە ســـام‌و ئێمـــە ئـــارین، هـــیچ وتـــارێ نابییـــەین[2]
چـــوار هـــەزار ســـاڵە لـــە چـــوار لا ئێمـــە کـــوردو تابییـــەین

(٤٢)

تـــۆ بـــە نـــاوی دیـــن نەخرچـــێی بیتـــە ماشـــەی هاوســـێکان
وەك ســـەدەی نـــۆو یـــانزە پێـــی کـــوردەواریی هـــەڵخزان
دەســـتی مـــن داوێـــنی تـــۆ بێـــت‌و چـــاوەڕاوی تورکـــەکان
کـــورد بـــەزێنێ دامەرزێنـــە، مەچـــۆرە جەنگـــەکان

---

١- تا بە دنیا: تا دنیا دنیایە ٢- نابییەن: نابیستن.

(٤٣)

چاوی بیمارت ئەزیزم شایەتە جووتێ برۆ[١]
هەر ئیشاراتێ لەبۆ من سەد شیفایە بێ درۆ
لەنجەکەت فەسڵی قەریبو غەمزەیە موختەس بەخۆ
کوا وجوودی بوو لە غەیری تۆ بە لەنجە بێ برۆ؟

(٤٤)

بەسیە ئیتر تۆ بخوێنەو بۆ قوتابخانە برۆ
تا بە کرداری نەزانان خۆت نەکەی زوو ڕەنجەڕۆ
با نەبی بێ مایە سووکو ناتەواو بی وەك پەڕۆ
با بژی ئاسوودە دڵ بنوێی بەشەو تاکو بە ڕۆ[٢]

(٤٥)

تەختی (شاهۆ)[٣] و کێوی (ئەلبورز)[٤]،(قۆپی)[٥] و(شەقلاوە) خۆ
هەر یەکە لوبنانی کوردە بۆچی لێی ناپرسی تۆ
خەستەخانەی گیانی کوردە سەد برینت بێتە سۆ
کاتێ بیرتدا هەواکەی هۆشو فامت دێتە خۆ

(٤٦)

بیری کوردی ئێمە وەك تیغی دەبان[٦] ئاسارییە
خۆر کە لێیداوە نەماوە تیژیەتی لاسارییە
گوڵگوڵی سەرجەوهەری بیری بڵاوەی کردووە
شیلگەری یەك دیگەری زاخاویدا سەردارییە

---

١- ئەوحی لەلاپەڕە (٦٠)ی دەفتەری ژمارە (٢)دا دەڵێت: ئەم چوارینەیە نیوەی شیعری یەکەم و نیوەی شیعری دووەم هی شاعیر (محەممەد بەگ)ـە، خۆیشی لە ساڵی (١٣٥١ك) بەرامبەر بە (١٩٣٢ز) لە کفری کردویەتی بەم چوارینەیە.

٢- ڕۆ: ڕۆژ.

٣- شاهۆ: یەکێکە لە لوتکەکانی کێوی داڵاهۆ، کە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی سەرپێل زەهاو.

٤- ئەلبورز: ناوی زنجیرە چیایەکی بەناوبانگە لە ئێراندا.

٥- قۆپی (قۆپی قەرەداغ): دارستانێکی بەناوبانگی دڵگیرە، خەڵکی بە هاوینان بۆ گەشت و سەیران دەچنە ئەوێ.

٦- تیغی دەبان: شیر، یان خەنجەری دەبان، تیغەکەی لە جۆرە ئاسنێکی پۆڵای زۆر نایاب ئامادە دەکرێت.

(٤٧)

سەر لە نوێ با ڕابوێرم بەو غەمەی پێرارەوە
لاشە بیمارو برینە دڵ بەسێ ئازارەوە
یەك غەریبی خۆمو سووکی کوردو قورسی کارەوە
دێ نشینو دڵ غەمینو چاو بە ئەشك و زارەوە

(٤٨)

تۆ مەدە تانە لە ئێمە، تانە بۆ چاو چا نییە
ڕەوڕەوە تاریکە دابێ بێ گڵۆپ بێ چا نییە
پاتری تیزابی ئەما چاچی نەکەی جا چا نییە
پیشەو مێژوو ببینە تازەیەو بێ جا نییە

(٤٩)

دەرزەنێ دەرزی مەراقی تۆ کوژێ عەیبی چییە؟
ئەو پزیشکەی دەرد ئەناسێ با بژێ عەیبی چییە؟
چاو لە دووری چاوی تۆ با خوێن ڕژێ عەیبی چییە؟
با نە یاری پۆلی ئێمە خوێن مژێ عەیبی چییە؟

(٥٠)

شەمشەمەکوێرە کەوا خۆی شاردەوە مایەی چییە؟
خۆ لە پرشە ناکەوێ خۆرو گۆنای مایەی چییە؟
داری ژەهری مارە ناخوێنەدوو ئیتر سایەی چییە؟
وردە بینی کوردییە کاکە مەڵێ سوودی چییە؟

(٥١)

سەرکەوی یا بەرکەوی مایەی ئەوە، هەر خوێندنە
تیپو دەستە لەشکرو لانەی نیاز هەر خوێندنە
هاتو دەروێشی بکەی بۆ پێگەیشتن خوێندنە
دینو دنیا وا لە ژێر سایەی قەڵەم بۆ خوێندنە

(٥٢)

هێــزی ڕۆســـتەم لــەم زەمانـــە بــۆ کەســێکە خوێنــدووە
عــیلمو عەشــقو تێگـــەیین بـــوو بێـــستوونی کەنـــدووە
پیـــشەو زانـــستییە هێـــزی لـــە مـــەردان ســـەندووە
هـــەر قوتـــابی مەکتەبـــە وا کیمیـــای لێ ژەنـــدووە

(٥٣)

خـــاکی پـــاکی کـــوردەواری گەوهـــەرە لێـــی دەربـــڕە
ئـــاوی کـــانی زۆرە پێویـــستی بگونجـــێ دەربـــڕە
مـــن بـــە پاچـــە کۆڵـــەوە چـــی پێدەکـــەم ســـەر هـــەڵبڕە
تـــۆ بـــە برژانگـــت لـــە کـــانی هەڵکەنـــەو چـــاو هـــەڵبڕە

(٥٤)

چـــاوی بـــادامی لەبـــەر جووتـــێ بـــرۆ بـــۆ ڕەشـــتووە
هـــەر کەســـێ ڕاوو تـــەمای بـــاغی بکـــا پێـــی کوشـــتووە
ژاری دووری بـــێ وەفـــایی مـــن کـــە لـــێم چەشـــتووە
کوردینـــە دوور بـــن لـــە ئـــەو یـــارە کـــەوا بەرگەشـــتووە

(٥٥)

کـــێ پـــەڵاس پۆشـــە بـــە کـــوردی یـــارە بێتـــە ڕیـــزەوە[1]
پـــشت (مـــەداین) کێـــوی حـــەمری تـــا بـــەلای تـــەبریزەوە
کێـــوی جـــوودی گونـــدی دادەر چـــۆمی بۆتـــان ڕیـــزەوە
مەڵبەنـــدی کـــوردن دیـــارن گەوهـــەرن لـــەبڕێزەوە[2]

(٥٦)

تێپـــەڕی عـــومرم تـــەمای ژینێکـــی تـــازەم کـــردووە
ڕاڕەوێ بـــۆ ڕەوڕەوەی قیرتـــاوی تـــازەم کـــردووە
شـــاری چـــوار لا بـــەر بـــەرەڵڵا تـــەختو تـــازەم کـــردووە
بـــۆ پـــەنا پێویـــستە لانـــەی ســـەر فـــێرازەم کـــردووە

١- شاعیر لەم چوارینەیەدا دەستنیشانی سنووری کوردستانی کردووە. ٢- لەبڕێز: لێوای لێو.

(٥٧)

دێنە سەرکانی حەمەبەگ ئاسکەکانی سەرپەچە
ئافەرین بۆ ئەو کچەی بۆ یاری خۆی گەردن کەچە
کۆرپە ئاهوو وا لەسەر قەبرانەوە بۆ ناو قەلا
دلرفێنی ئەو قوتابیانەن لە مەکتەبدا بەچە

(٥٨)

ئەم وتارە بێ سەرو پاگردو کۆی سێی سالمە
با لە لای تۆ بێ بمێنێ هێزی هەردوو بالمە
هەرمێ پشکووان بیست و دوو، نەورۆزی کورد، مالمە
کوشتنی پیری حەموورابە کەوا سەر سالمە[1]

(٥٩)

چاوەڕاوی شاهی ئیسلام کوردی لێک جوێ کردەوە
بوونە ژێر دەستەی نە یارو سەرکزی و بێ کردەوە
بوونە شوانکارەی هەموومان وەک مەڕو مالاتی ورد
خێرو بێرو موزدو[2] مەرجی ئێمەی بۆ ئەو بردەوە

(٦٠)

گەردنی زیوت زەڕنگەر کوانێ قالی[3] کردووە
دوو لە ژێر سوخمەی گەبەردین پرتەقالی گرتووە
کوردە بۆچی نەیگری بۆکێ قالی کردووە؟
شەرتە گەنجی کوردی بیگووشێ کە بالی گرتووە

---

١- شاعیر دوو جەژنی نەورۆزی بۆ کورد دەستنیشان کردووە: یەکەمیان ئەو ڕۆژەیە کە حەمورابی کوژراوە و دووەمیشیان ئەو ڕۆژەوەیە کە کاوەی ئاسنگەر زوحاکی کوشتووە.
٢- موزد: پاداشت.
٢- قال: تولوە، لەکار دەرهاتوو.

(٦١)

خاڵی رووتە پایتەختی عاشقی کوردانەیە
زوڵفی سێبەر خاڵی گەوهەر داوە خۆ هەم دانەیە[١]
دوو وەزیری دادو جەنگی دوو برۆی سەرچاوەیە
خاکی چۆڵە کۆڵ بە کۆڵە ڕەوکەرە کوردانەیە

(٦٢)

تورکمانە خۆ لە بنچینەو بناغە کوردییە
تورك ماننـدەن بە تەرکی بەرگو شێوەی کوردییە
پێنجی تارە بۆ ژمارە تانو بێ پۆو دەردییە
بوونە کاکی جەژنی لە ئەملا بوونو ئەولا کوردییە

(٦٣)

عەشقو مەشقو ڕەزمو بەزمی کوردییە
پیتو بەرگو گیانو مانای کوردییە
ناوو دەرپشتو بەری هەرچی هەیە
مێژووە هۆنراوەیەکی کوردییە

(٦٤)

زوڵفی حەڵقەیدا لە سەر گۆنا چەناکەی گرتەوە
وەك خەریتەی چینو ژاپان هەردوو لاکەی گرتەوە
گەنجو خاکی کوردەواری هەر بە غەمزەیێ گرتەوە
مەر قوتابی کوللییەی عەشقی شەهادەی گرتەوە

(٦٥)

بەم شەشی ئەیلولە وا پایز گەڵا ڕێزانییە
هەڵپەیە مەڵبەندە جەنگی ماڵو سەر خێزانییە
بەر سەرا تا گردی سەیوان ڕیز لەسەر ڕیزانییە
دەك بژی بۆ دەستو خەنجێرو پەلامار دانییە

١- دانە: بەردێکی بە نرخە لە شێوەی ئەقیق، زۆرتر لە ڕەنگێکی هەیە: سپی، شین، سەوز.

(٦٦)

دڵ هەوای مەڵبەندی کریا کەوتە تاوو لەرزەوە
یەکێتیو سەربەرزی پێ بوو ئەو هەوا بەو بەرزەوە
باڵەپەستۆی ئەو هەوایە دای لە هەردەی مەرزەوە
دڵ شیفای بۆ هاتو ڕۆیی تا نەما بەو لەرزەوە

(٦٧)

ئەو گڵۆپی ئاڵی ڕووتە، ڕۆشنی گیانی منە
خۆ بسوزێ خاڵی گۆنات دینەمۆکەی هی منە
قەد عەموودی کارەبای تۆ ڕاستە بۆ تێلی منە
گەر بە بیری پۆلی عاشقکا ئەوە چاوی منە

(٦٨)

هەر مەلایێ گەر کتێبی گرتەوە باوەڕ مەکە
یاخۆ ئەو شێخە بە بڕیە نوشتەکا باوەڕ مەکە
دەرسی زانستی حەقیقەت وەرگرە جا تێدەگەی
هەر شەریعەت ڕاگرە ئیتر کەسێ ئازارمەکە

(٦٩)

چنگی گیر کردووە لە دڵما پەنجەکەی نەخشاندووە
سەد کتێبی عەشقی بۆ چوو چاوی پێ نەخشاندووە
ڕازی پۆلی عاشقانی بۆ نەیار پەرژاندووە
سەد فڕۆك سوارە کە ئەندامی پیادە ماندووە

(٧٠)

تێگەیشتوو زۆرە ئەمما حەق پەرستی وا نییە
یا هەیە پۆلێ لەترسانا هەڵستی وا نییە
یا بە عەشقی یەکێتی ئەمڕۆ کە بڕستی وانییە
حەققی من لەو یارە سێنێ کوا بڕشتی، وانییە؟

(٧١)

شێخە دێیە تاکە شێخێکی شەرەفداری هەیە
ئەهلی حاڵو شەرعە چونکە شوێنو ئاساری هەیە
چڵ نەوەی بێ خێرو سواڵکەر پیشەو کاری هەیە
چۆن بڵێم چاکن هەموویان کوردە ئازاری هەیە

(٧٢)

مەستە سەربەستە چ دەربەستە لە باخا یاخییە
ئەو ئەزانێ لێوو گۆنای خۆی وەکو گوڵباخییە
کوردە سووتاوە لە حەسرەت، خاڵی لێوی داخییە
بۆیە ڕوو زەردی بە ئێمەمان نیشانەی ساخییە

(٧٣)

قەسری شاهانەو دەواری کوردییە لای من یەکە
کوردو کرمانجی بە دوو بن یا بەسێ لای من یەکە
خانو دەروێشو بەگو میر، بیری بێ، لای من یەکە
غەیری خاڵی لێوی یار دڵسۆزە کوا لای من یەکە

(٧٤)

کوردی ئێمە تێپڕژاوە خاکو مەڵبەندی یەکە
گەوهەرێکە هۆنراوە، ڕیشەو بەندی یەکە
هەڵبژێراوە لە ئاسیا سێ سەرو بەندی یەکە
مەر بە بەرگو یەك زمانی بێتە نۆکەندی[1] ئیکە[2]

---

١- نۆکەند: شەقە جۆگەی زل بۆ تێکەڵاوکردنەوەی ئاوی دوو سەرچاوەی لێك دوور.
٢- ئیکە: هیتر، ئیدیکە.

(٧٥)

میللەت نەماوە ئەمڕۆ بێ شوێن و ڕەنجەڕۆ بێ
هەر کوردە پەست و بێ سەر، ئاخۆکەی سەربەخۆ بێ؟
زانا و خوێندەواری، هەمیشە پیشەکاری
گەر بێتە کوردەواری، ئەمجا تەمات بەخۆ بێ

(٧٦)

میللەتێ ناوی بە ئەمجەد دوو سەد و سی[1] بێ ئەبێ
دەرکەوێ هەم بەرکەوێت و سەرکەوێ کۆسی ئەبێ
کۆسی گردی لێبدا کوردانە خۆی دۆسی ئەبێ
زۆری مەعنایە لە ناوا ناوک و پۆسی ئەبێ

(٧٧)

دڵ وەکو کوردە بە دووی یاری ستەمکارا ئەچێ
دەشتی پانی تەختی خۆی بۆ هەڵکەوێ پێیدا ئەچێ
باری لاری یاری ئێمە ڕاستەوە ناکا ئەچێ
بەردەمی تەختی نە یارم بۆ دەماڵێ شا ئەچێ

(٧٨)

لەو شەپۆلی کورتە کەم کەم وا بڵاوەی پێ ئەدەی
چاکە هەرچەندە بە بۆنەی ئیکەوە خۆت با ئەدەی
زۆرە بۆ ئێمە لە خوا بە زیاد کە ئەمری وا ئەدەی
یانی ئێمە هەین و ماوین بۆیە وا خۆت ڕا ئەدەی

(٧٩)

تۆکە سەرتیپی حەبیبانی لەگەڵ بۆ تۆر ئەکەی؟
یا لە دڵداریێ کە ئەندامی برینە زۆر ئەکەی
کۆمەڵێ پێویستی عاشق بۆچی وا خاپوور ئەکەی؟
شینی لاوانی ئەتۆیە بۆچی چاوم سوور ئەکەی؟

---

١- ژمارەی (٢٣٠) بە پێی ئەبجەدی دەکاتە ناوی (کورد) و ئاکامی بەم جۆرەیە: ك=٢٠، و=٦، ر=٢٠٠، د=٤.

(٨٠)

ڕۆژی هەڵگیراوو داوی تێکدراوم بۆ ئەوەی؟
بۆ شەبەیخوونی لە ناکاوا بە دوویا هەڵکەوێ
هەڵبدا بەیداخی کاوە دڵ لە کاوەی خۆی داکەوێ
تا بگاتە تەختو بەختی سەر بەخۆیی‌و بسرەوێ

(٨١)

دڵ بە ئێشی داخی دووری تۆوە جەرگی بڕی
چاوی مەستی تۆ بە غەمزە هاتو عەقڵی لێکڕی
تۆ لە باغی خاڵی گۆنات بۆچی ئەمنت کرد بەری
تۆ لە نازدارانی کوردی لای ئەمن خۆ چاتری

(٨٢)

لێنەزانی‌و پێنەزانی تۆیە وا جەرگی بڕی
کۆنەپۆشی بەسیەتی خۆ چوار هەزار بەرگی دڕی
تازە پۆشە بەرگی کوردی ڕانک‌و چۆغەی مەنگوڕی
تا لە کاتی هەڵمەتی دوژمن بە پێوە خۆتگری

(٨٣)

پەیرەوی بێگانە بی تا فێر ببی پیشەوەری
تا دروستکەی فڕفڕۆکە بۆ خۆتو پێی سەرکەوی
با لە هەردەی کوردەواری سەیر بکەی بەرزی‌و نەوی
جا لە جێماوانی دنیا چاکە ئینجا بەرکەوی

(٨٤)

خوێنی کوردی خۆرهەڵاتو خۆرنشین تێکەڵ بکەی
قەت جیا نابێتەوە ناتوانی هیچی کەل بکەی
کوردەواری شارەزایە پڕ دەبوستانە هەموو
تازە ناخرچی[1] لەبۆ تۆ خۆت ئەگەر پەل پەل بکەی

---

١- ناخرچی: ناخەڵەتێت.

(٨٥)

سەد کەس بەم جۆرە ئەژمێری لە مێژوو تێبگەی
خۆت ئەدۆزێنی لە تۆڵەی هەر هەڵەیەك پێی بگەی
بێنە بەرچاو هەرچی کوردە خۆت نەکەی جیاوەبکەی
با (خولە)[1] سەربێت و تۆپی سەر[2] بە شاباشی بکەی

(٨٦)

سەرچەمی قوشقانە خۆشە پێمەلەی تێدا بکەی
جا لە چاخانە تەماشای قۆپی و سەر پرد بکەی
گەر بە چەپ ڕوو وەرگەڕی کانی هەیاس بەگ[3] دەرکەوێ
پۆلی پۆیلەدار بە لەنجە دێنەوە سەیری بکەی

(٨٧)

شیشە ئەندامی شکا بازاڕی هاتو چۆیەتی
ئەو سەرۆکی دڵبەرانە تامی مەزەی خۆیەتی
هەر گردو کاشی[4] هەژاری عاشقە بۆ تۆیەتی
تۆ بە چۆغەی لەندەنی ئەو ڕووتە وا بۆ سۆیەتی

(٨٨)

بەسیە دوکانی وەفا بۆ کاروانی دامەنێ
نەوجوانانی وەتەن بۆ خاکی غوربەت ڕامەنێ
تۆ لەبۆ پێویستی ئێمە گەر نەبێ پێدامەنێ
تا بە بیری گەل نەبێ تاجت لەسەرتا دامەنێ

---

١– خولە: مەبەست لە شێخ مەحموودی نەمرە، چونکە لە کوردەواریدا زۆرجار بۆ ناوی مەحموود (خولە) بەکار دێنن. چوارینەکە لە سەردەمی شێخ مەحموودی حەفیدا وتراوە، بۆیە بەرگری لێ دەکات.

٢– تۆپی سەر: مەبەست لە هەموو خەڵکییە.

٣– هەیاس بەگ: چەمی قوشقانە، قۆپی، سەرپرد. ئەمانە هەر هەموویان لە شارۆچکەی (سەقز)و دەوروبەرین. لەو شیعرەدا ناوی چەمی قوشقانەی هێناوە کە دەڵێت (بیست و پێنج ساڵە پەشێوی تۆم ئەی وەتەن) و ئەو شیعرەی لە نووری (سەقز) وتووە.

٤– گردوکاش: گردوکۆ.

(٨٩)

شەمسەددینی وەرمێ[1] شێخێ بوو بە چاو داگرتنێ
کوردەکانی کردە هێزی تورکو بەغدا گرتنی
خزمەتی سولّتان مورادی ڕابعی[2] بۆ دین ئەکرد
پێچەوانە پڕ بەهانە ئەمریدا بۆ کوشتنی

(٩٠)

چەن تەبەق عەرزی بە دووربین، تاقییەوە کردو کەچی
حاسیلاتی لێ دروستکرد ئارەزووی لێ بوو هەچی
کوردی ئێمە کەوتە داوی خۆ فرۆشی هەرچیو پەچی
پیشەیێ بۆ فێر نەبووی ئاخر بە خۆڕایی نەچی؟

(٩١)

شیشە بۆنی کوا هەتاکو بان دەمی لێ لانەدەی
سینەو فینجانی مەم کوا تا یەخەی پێ لانەدەی
شەوقی مەجلیس کوا ئەگەر ساقی بە پیاڵە چا نەدەی
سەوزە کوا مەززەی هەیە گەرمایە کە بەفراو نەدەی

(٩٢)

دانێ لەق بێ چاری کێشانە لە دەمتا با نەبێ
ئیش بە دەستێ گەر بدۆڕێنی مەبەس لاتا نەبێ
خوێنە خێوی تۆ ئەوەی کوردە لەبەر پێتا نەبێ
بیخە سەر کارێکی وا خوێڕی نەبێ لاتا نەبێ

---

١- شەمسەددینی ورمێ: زانایەکی ئایینی کورد بووە لە کوردستاندا، فەتوای داوە کە کەس دژ بە سولّتان موراد ڕانەوەستێت و بە پێچەوانەوە کافر دەبێت. لە پاشاندا سولّتان ئەمیشی کوشتووە.

٢- سولّتان موورادی ڕابع (چوارەم): سەرۆکی تورکیا بووە، مرۆڤێکی شەڕخواز و دیکتاتۆر و بکوژ بووە، لە ٩(/٣/١٦٣٨ن) بە سوپایەکی زۆرەوە هێرشی هێنایە سەر بەغدا، لە (١٦٣٨/١١/١٥ن) بەغدای گرت و بە هەزارانی کوشت، بە تایبەتی ئەوانەی ئێرانی بوون.

# غوثی بغدا

تــو کــه غواصــی ز بحــر کــرم و ســرّ خُــدا
لطــف داری بعمومــا چــه بــشاهُ چــه گــدا
فنــدق دارمُ صــد بحــر غــم انــدر توشــد
ز تــو خــواهم کــه رهــای بنمــای تــو خُــدا
خَطَــر و خــوفُ خیــالاتُ محــالاتُ عَبــث
نقطــه دل بگرفتنــد چــه چــاره تــو خُــدا
خود بفرمودی جهان قبضه‌ی تـصریف مـن است
ســگمُ معتقــد قــول تــو هــستم بخُــدا
پــاره پــاره اســت دل (نــوحی) مــاتم زده خــود
دفــع خواهــد ز تــو غــوث الــثقلین بخُــدا

# مسند آرای طریقت

مـــسند آرای طریقـــت تـــاج بخـــش اولیـــا
نـــور چـشم مـصطفی و پـــی روی آن مـصطفی
حامـــل علـــم رســـول و معـــدن اســـرار حـــق
کامـــل شـــرع طریقـــت صـــف در روز وغـــا
هـست چـون بـو بَکـر صـادق جانفدا مثـل عُمـر
در حیـا عثمـان باشـد چـون علـی جـایش عـلا
گـشته تـصنیفش بـدائم در جهـان مـشهور خـود
نقـــشبندی زو شـــده تـــرویج دَر اطـــرافهـــا
دَر ســخا هَمتــا نَــدارد حــاطم آســا دَر جهـــان
مینمایـــد مـــال خـــود مـــصروف دَر راه خُـــدا
در جُبَـــیَش مظهـــر نـــور خُـــدا بیـــنَم عیـــان
میدرخـشد چـون قمـر بـا پرتـو و صـاحب ضـیا
شـــه معـــین الـــدین یعـــنی عـــالم علـــم طریـــق
کـرد محکـم دیـن حـق را چـون سـتون آنبـا وفـا
بـــر دائـــم بـــر قـــرار و در پنـــاه لطـــف حـــق
چـــون امامـــان شـــریعت هـــست اکنـــون مُجتبـــی
از قـــدوم مقـــدم صـــیت جلالـــش گـــر شـــود
بـــر فـــروزَد مـــشعله از فـــوق تـــا تحـــت الـــسری
در پنـــاه خـــویش فرمـــا خـــالق هـــردو جهـــان
جُملگـــــی اولاد او را، از بـــــلا دورش نمـــــا
مـــن دعـــانی وصـــفهُ عنـــد جـــواب ســـائغ
شـــرعُهُ شـــرعُ نَبـــی علمـــه کالمرتـــضی
(نَـوحی) بـا لطـف تـو دارد ادعـای سـلطنت
بـــاز خواهـــد عـــزت و عُمـــر جَلالـــت از خُـــدا

## فصل بعید نوعي فصل قریب

فـصل بعیـد نـوعی فـصل قریـب جـنس اسـت
جـنس بعـد نـوعی جـنس قـریبی جـنس اسـت
تاکـه رسـی بـه جـوهر حکـم همینکـه دانـی
لیـك تـأملی را میـان فـوق جـنس اسـت
هـر چـه کـه نـوح گوینـد عـارض هـست بـر او
نـوع حقیقـی انـسان اضـافی هـر جـنس اسـت
آنـچه عـوارض عـام هـست بـرای هـر نـوع
نیـك تفکـر کـن جملـه خـواص جـنس اسـت
حاصـل هـر حواشـی شـرح متـون زینجـا
(نـوحی) بـدین ببـوت، فـصل نمـای جـنس اسـت

## پیش که برم شکوه دل

پـیش کـه‌برم شـکوه دل از سـتم دوسـت
برشـه کـنمش عـرض کـه ایـن هـم اثـرش زوسـت
بـر فـرق نهـم تـاج کـی ازکـی شـودش لطـف
لیکن هم از ایـن سـستی بخـت اسـت نـه از اوسـت
روحانیـت شـیخ گواهـست بـر مـن
چـون شـاهد سـر دلو رگهاسـت بهـر پوسـت
بـر قاعـده اخبـار دهـم جـسم لطـیفش:
این دل که بـه شمشیری جفـا قطعـه‌و توتوسـت[1]
از غـم نرهیـده کـه زیـاد میـشودش درد
(نوحی)ست دوامـی مـی‌طلبـد از شـه و از دوسـت

---

١– ئەم نیوەدێڕە، پیتی (ی) لە شمشێردا زیادە.

## ما بغیر از تو نداریم

مـــا بغـــیر از تـــو نـــداریم دیگـــر هـــیچ کـــسی
تـــو نپرســـید ز حـــال مـــن خـــسته نفـــسی
خـــرم از دردو فغـــانم کـــه ســـبب کـــار تـــوئی
چـــون نـــداریم بغـــیر تـــو چـــه فریادرســـی
مـــا طلـــب میکنـــیم از جـــام جهـــان یـــك جرعـــه
هـــم حبیـــب اســـت طبیـــب اســـت مـــددکار بـــسی
آب چـــشم آتـــش دل خـــون بجگـــر میریـــزد
ویـــن عجـــب از تـــو اثـــر مـــی نکنـــد یـــك نفـــسی
بهـــر (نـــوحی) بـــزن ای مطـــرب مـــا یـــك نغمـــه
چـــون نـــداریم بـــه پـــستان حبیـــب دسترســـی

## از غایت تحیر

از غایـــــت تحـــــیر در انفعـــــالم هـــــردم
مهـــر دیگـــر فزایـــد چـــرخ فلـــك نـــبردم
روح لطیـــف در جـــسم؛ جـــسم کثیـــف بـــا اســـم
آن ز عـــیش دنیـــا اســـف بـــسر نـــبردم
از نـــزد هـــر ادیـــبی بـــسوی هـــر طبـــیبي
عـــلاج نیـــست، درمـــان بـــرای دفـــع دردم
ای فـــرد وقـــت زنهـــار ظهـــیر ناتوانـــان
سرگـــشته ام پریـــشان، عـــلاج چیـــست دردم؟
نـــوحی ســـگی اســـت شـــاها از غیرتـــت چباشـــد
اورا راهـــای بنمـــا از قیـــد وکیـــد؛ هـــردم

## در مدح پیغمبر

ای ز تـــأثیر قـــدومت طـــاق کـــسری منهـــدم
وی ز تأمـــل حـــدیثت شـــاه خـــسرو منعـــدم
ای قـــدت ســـروی جنـــان وی جنـــان مـــأوای تـــو
بیخـــبر اهـــل تجاهـــل از مکـــان محتـــشم
بـــاز گـــویم ســـر ایـــن نکتـــه بـــر اهـــل عقـــول
شمـــس مـــاه از روی تـــو بودنـــد اول منـــتظم
انـــت شمـــس المعنـــی فی بـــرج الجنـــان، انـــت القمـــر
انـــت فخـــر العـــرب انـــت شـــافع الکـــرد والعجـــم
نـــور تـــو از نـــور الله بـــود اول منـــشبع
انبیـــاء اولیـــاء از نـــور تـــو بودنـــد هـــم
منفعـــل هـــستند مـــاه خورشـــیدو ســـیّاره از
شعـــشعه رخـــسار تـــو از روی یـــوم الحـــشرهم
یـــاد کـــن ای نوحیـــا تـــو آیـــه‌ی لـــولاک هـــم
تـــا نباشـــی دردمنـــد از وصـــف آن شـــاه ختـــم

## مرثیه

به پرگار فلك سطح است ویران
از آن قطرانی شد برگ ضمیران
دمادم سیل اشك، موج خوناب
ز دیدەی كوردی آید مثل گوران
كوره أرض‌و سما مستند ماتم
ثریا عقد ریزد مثل باران
كژو كوه فضاو دشت هامون
همه خشك‌و سیا جَوفَند و گریان
فرشته میزند دست تغابن
ز دست چرخ گردون، جور دوران
(محمد بیگ)[1] ز نصل شاه جافان
سفر كرد از سفر بی وعدو قیران
ز سقف‌و سطح‌و جسم و جوهر كُرد
عرض ریزندو (نوحی) هست حیران
مجرد ز آن همه روحی گسسته
تعلق بست با فردوس رضوان
بتاریخ رحیلش میفرستم
(زهی غفران)[2] بروحش همچو یاران

١– محەممەد بێگ (١٩٠٤– ١٩٢٤ز): كوڕی فەتاح بەگی جافە، ناودارێكی ناسراوی كورد و هۆزی جافە، بە كوردیش شیعری بۆ گێڕاوە.

٢– زهی غفران: بە حیسابی ئەبجەد دەكاتە (١٣٥٣ك) بەرامبەر بە (١٩٢٤ز) كە ساڵی مردنی محەممەد بەگی جافە. (ز= ٧ + ه= ٥ + ی= ١٠ + غ= ١٠٠٠ + ف= ٨٠ + ر= ٢٠٠ + أ= ١ + ن= ٥٠) كە هەمووی دەكاتە (١٣٥٣ك).

شکا پشتو براجەرگی هەموکورد     بەأو دە نگەی لە ناگاوا دسو برد

جیهانی تنگەیاندو خستیەلەرزە     سەبی ئەتە شمە روژی چواری جولود

گیزەی جەرگو قژەی دڵ ماوە نادا     بڵیم داباخی کوردم رویی ایکورد

شلەژا آسمانی کوردی بدبخت     شمال شاباشی گیانی شاهی محمود

تەمی غەم گیژە لوکەی روژی ناشاد     لەکەس باهەڵ نەنا أمرو وکو کورد

برینی شیخی بەرزانی بەسرێە     أمیش هاتە لا هانابە ایکورد

پزشکی هەڵکەنراوی وسی بو     أوی کوشتو امی گرتو اوی بورد

اتمە کوردە بنالینن بگرین     لەگەڵ ژیتی خوبا ژیی ایمەشی بورد

بپەر ژینە خوا آوی سبوری     بەسەر کوردا لەگەورە تاکو ورد

بەمرگی نەم بە جیا بو     بەمیژو هەزار و سیسەد و هەفتاو شش مورد

١٢٧٦     ایتر نوچی هەوای وایە لەم ولا

کەئەم هاتە بەدریتەگەلی کورد

باغی دڵ سوورە لە داغی خاڵی ڕووی خۆم شینەکەم    دوور لە میحرابی برۆی تۆ سوژدەگاهی دینەکەم

دڵ وەکو کۆترەسی قەسابو چاوی وەکو جۆگەی دەڵێن    وام لە مەیدانی مەراقوا ئەسپی غەم وازینەکەم

دوور لە خەطی لێوی ئاڵو ڕەمزی غەمزەی چاوەکەت    بەندە هۆشی لانەماوە تازە کوێرە زەهنەکەم

تا کو دوێنێ لوتفی تۆ بو منکە خووم پێگر تبو :    زەحمەتە تازە لە دووریت باقیمانو ژینەکەم

تووەرە دەرمانی دەردەکەم بکەو باکت نەبێ    شارەزانابی نەزاری سەگ بکەینو بەبینەکەم

چاوەڵینە بوەنی کوژراوی تیری چاوەکەت    ئەو ئیشارەی تۆ شیفایە بوبرینی سینەکەم

چونکە تۆ سەرمەزهەبی نوحی وەمەحبوبی ئەوی
بافیدای تۆبێ دڵو ڕوحو سەروهەم دینەکەم

دەخیل ساقی بدە جامی بە غایەت دڵ پەریشانم    دەمێکە مەخموورو غەمبارم دەمێ سەرخۆشی هیجرانم

غەریبو بێکەسو ماتومە لولو عاجزو بێ هۆش :    لەبەر تانەی کەسو ناکەس ئەم ئێستا دیدە گریانم

غەمو بوهتو هەمو دەردی کەرو یداوە لەدڵ ئاخر    تەداوی ئەو مەحاڵە ای طەبیب با وەربکە جانم

مەگەر نوری خوا یەعنی ڕسول اللەی ئەکرەم بێ    ببێتە شەوق حوجرەی دڵ وا لا ئێستە ویرانم

دەمێکە بوونی بزراوی دڵم دەبینن هەموزانا    بەزەیت بێ ئەتوش ئەمڕو بە حاڵی قەلبی بریانم

لە بالەبەر بکە ئەو بەردە بینە بەخێری خوت    هەتا دەرچێ غەمی کۆنە لە دڵمانە تازە میوانم

دەمێ بێ ئاکو سەرپەستو دەمێ ترسو کو سەرمەستم
هەتا فەرموو لە جەژنا نوحیە بو قوچی قوربانم

لە مردنی شێخ محمدی شێخ عبدالکریمی قادرکەرەما وتراوە

لە کوردا هەمیسان چەقەومایەوە — بەم شێوەتە دڵ ئەبورایەوە

گوڵوپ وەجاخی سەروک آئینە — نەبیرەی حوسەینی بو کوژایەوە

لە قادرکەرەم شێخ محمد کە وا — لە جادەی تەریقەت سرەوبایەوە

شەریعەت عەزاخوان تەریقەت ئەڵێ — محمد لە رایە کە شارایەوە

بە ابجد خوا رحمتی حق بڵا — بە مێژووی ئەو کوچی پێچایەوە

١٢٧٢ هـ

سوپاسی خوا جێ نشینی هەیە — گوڵی تازە لەو باغە رازایەوە

مسا برایم خەلیلی وەتەن — لە بوستانی ژینە ئەژیایەوە

شێعر بو جەناب شێخ عبدالکریمی قادرکەرەم ١٢٧٢ هـ

تەمی ماتەمی ترنە ررەوایەوە — کە هەوری خەفەت هەم یەکی دایەوە

فەلەک گاڵ ئەداغەم ببارینی هەم — لە ماوەی کە مێدا خولی دایەوە

لە آسمانی رێگەی تەریقەت کەوا — ستارەی بەیانی دەرەوشایەوە

سەرەکاپولی دەرویشی آئینی پرەست — لە جادەی ژیانا کە هەوی دایەوە

لە نوتفەی حوسەینی بەوینەی حسن — کە عبدالکریم ژینی هەم دایەوە

سەروکی مسقف صریح و ئەدیب — بە ئیرشادی دەرویش و کورد مایەوە

پسا بەعزی ئەنداسی دەرویشیان — بە جێدار جادە سپی رایەوە

بەزانستی ابجد لە بو باشە روژ — لەم زمانە نوحی ئەپارایەوە

بە مێژووی ساڵی وفاتی ئەڵێ
بەهشتی خوای کوچی گلدایەوە

١٢٧٢ هـ



وێنەکەی (نەوحی) لە دیوانا بە خزمەت تۆ ئەگا

چونکە دڵسۆزە بە ئێوە خۆییەو خزمەت ئەکا

هەر وتارێ , گەوهەرێ , هۆنراوەیەکی سەد مەبەس

تێبگەی ئینجا ئەزانی تێکەیی‌و خزمەت ئەکا

بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی وشەکانی ناو ئەم دیوانە، کەڵك لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١. فەرهەنگی دەریا، ڕزگار کەریم، بەرگی ١-٢، چاپی یەکەم، چاپخانەی مەهارەت، تاران، ٢٠٠٦.

٢. فەرهەنگی هەمبانەبۆرینە، هەژار، تاران، ١٩٩٠.

٣. فەرهەنگی عەمید، حەسەن عەمید، تهران، ١٩٨٢.

٤. فەرهەنگی کوردستان، گیوی موکریانی، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ١٩٩٩.

٥. فەرهەنگی دیوانی نالی، د. مارف خەزنەدار، دارالحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧.

٦. المعجم العربي الأساسي، تأليف: واعد جماعة من كبار اللغوين العرب، تونس، ١٩٨٨.

## ناونیشانی هۆنراوە

## چوارینەکان

## پێنج خشتەکی

## شيعره فارسييه‌كان

# Dîwanî

# Mella Hesen Newhî Zengene



Projey Enstîtûtî Kelepûrî Kurd

Kokirdinewey: Herdewêl Kakeyî

Enstîtûtî Kelepûrî Kurd